**ئەم پەیامە:**

* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فاورووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.
* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز.
* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٦٨)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

# پێشەکی

## نوورسی و ئەدەبی ئیمان

به پێنووسی مامۆستا
**ئەدیب ئیبراهیم دەباغ**[1]

جگە لە چەند ئەزموونێکی ئەدەبی و هەندێ لێکـۆڵینەوەی ڕەخنەیـی، دەنـا لەم سەردەمەی خۆماندا و هەتا ئێستاش گۆڕەپانی جیهانی ئیسلامی، بە تایبەت عەرەبی، پێویستی بە چەند بەرهەمێکی وەهایە کە بگونجێت لە قوتابخـانەیەکی ئەدەبیی ئەوتۆدا بەرجەستە ببێت و ڕۆڵـی دەربکەوێـت کە "ئـیمان"ی لە ئـامێز گرتبێت و، پایە و ستوون و یاسا و دەستوورەکانی لەسەر بنـاغە و ڕاستییەکانی "ئیمان" بنیات نابێت و، چەندین کەڵە ئەدیبی بە توانا و پێشڕەوی خۆی هەبێت کە ئەو قوتابخانە ئەدەبییە لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگ بداتەوە.

گومـان لەوەدا نیـیە کە "هـزری ئیسـلامی" لەم سـەدەیەی دواییـدا گەلـێ نوێکاری و بەرەوپێشچوونی بەخـۆیەوە بینـی، بەڵام "ئەدەبی ئـیمان" نەیتـوانی

---

(١) ساڵی ١٩٣١ز لە مووسڵ لەدایك بووە. بڕوانـامەی "دیپلـۆم"ی لە پەروەردە و فێرکردنـدا بەدەسـتهێناوە. گەلـێ بـابەتی لە چەنـدین گۆڤـار و ڕۆژنـامەی عێـراق و دەرەوەیـدا بڵاوکردووەتەوە. لە یەکەم دەستەی شارەزایانی ژیانی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی نوورە لە عێراقـدا. حەڤـدە کتێبـی بڵاوکـراوەی هەیە، کە سـیازدەیان تـایبەتن بە مامۆسـتا نـوورسی و پەیامەکانیەوە. لە ڕۆژی چوار شەممە بەرواری ٢٠١٧/٥/٣١ز لە ئەستەمبوڵ بە نەخـۆشی کۆچی دوایی کرد. خوای گەورە لێی خۆش ببێت. (وەرگێڕ)

شان بە شانی ئەو پێشکەوتنە هەنگاو بنێت و بە چەندین قۆناغی زۆر لێی دواکەوت، کە ئەمەش دیاردەیەکە بە دەگمەن لە ڕێڕەوە فیکرییەکانی دیکەدا ڕوو دەدات، چونکە ئەو ڕێڕەوانەی تر هەر ئەوەندەی پەیدا دەبن، یەکسەر قوتابخانە ئەدەبییەکانیشیان بە دوایاندا سەر هەڵدەدەن و پشتی ئەو ڕێڕەوە فیکرییانە دەگرن و بانگەشەیان بۆ دەکەن و پێش‌چاویان دەخەن.

هەرچەندەش گەلێ هۆکار بۆ ئەم دیاردەیە باس کراوە، بەڵام پێموایە هۆکاری سەرەکی دووری و ئامادەنەبوونی "گیانی بینەر و هەستیار"ە لە گۆڕەپانەکەدا، دوای ئەوەی کە ئەو "گیان"ە بوو بە ژێر تەپوتۆزی "دواکەوتوویی"ی چەندەها سەدەی یەك لە دوای یەکەوە..

هەروەك هۆیەکی گرنگی تر دەستەوسانیی هەستی ویجدانییە لە چەشتن و پەیبردن بە جوانیی ئەم "فیکر"ە و هەستکردن بە کاریگەرییەکەی و، پاشان دەربڕین و تەعبیرکردنی ئەو پەیبردن و چێژ و هەستە بە شەفافییەتێکی ئەدەبیی ئەوتۆ کە ویژدان ببزوێنێت و هەست و شعووری مرۆڤ ڕابچڵەکێنێت..

جگە لەمانەش، هۆکارێکی سەرەکیی تر کەمیی ئەو پێشڕەوانەیە کە "ژیری" و "ویجدان" لە ناخیاندا یەکی گرتووە و، بە "دڵ"یان بیر دەکەنەوە و بە "گیان"یشیان ئەرکی "ژیری" ڕادەپەڕێنن و شتان هەڵدەسەنگێنن!

مامۆستا "نوورسی"مان یەکێکە لەو پێشڕەوە دەگمەن و کەمانە. چونکە سەرچاوەکانی "هزر" و چاوگەکانی "ویجدان" لەودا یەکیان گرتووە و لە قووڵایی دەروونیدا سەرجەمی کانیاوەکان بە یەك گەیشتوونەتەوە و تێکەڵی یەکتری بوون و ڕووبارێکی هێندە مەزنیان پێکهێناوە کە تاوێك "هزر" و تاوێك "ویجدان" لێی هەڵدەگوزێت. ئەوەتا (بەرهەمە ویجدانییەکانی) شان بە شانی (هزرەکانی) دەڕۆن و، (گیان)یشی لەگەڵ(ژیری)یدا هێندە دەست لەملانە کە لە یەکتر جیا نابنەوە!

مامۆستا نوورسی بە نووسینەکانی خۆی، بناغە بۆ قوتابخـانەیەکی ئەدەبیـی ئیمانیی ئەوتۆ دادەمەزرێنێـت کە دەتوانرێـت لە لایەن ئەدیبـانی ئـیمانەوە چ لە پەخشان و چ لە هۆنراوەکانیاندا، پشتی پێ ببەسترێت.

نوورسی بە باشی لە "دەروون"ی مـرۆڤ گەیشـتووە و بە وردیـش پەیـی بە بۆچوونەکـانی "دڵ"ی بـردووە. چـونکە زۆر بە درێـژی لەسـەر کەنـار و سـنوورەکانی ئەو دڵە ڕاوەسـتاوە و سـەرنجی داوە. هەروەهـا پێـی وایە تاسەمەندیی دڵی مرۆڤ بۆ "مانەوە" و "نەمری" کانیاوێکی هێندە بەخـوڕەمە کە دەتوانێت ئەدەبێکی ئەوتۆ بتەقێنێتەوە بە یەکێك لە جوانترین و نایابترینی ئەدەبی شەوق و تاسەمەندی و پەژارەی بەسـۆ دابنرێـت کە گـرۆی مـرۆڤ بینیبێتـی و پـێش چـاوی کەوتبێـت! لەو پـارچە پەخشـانەیدا کە ناونیشـانی ﴿**لا أحِـبُّ الآفلين**﴾ی بۆ داناوە[1]، ڕووکارێکی وەك ئەمانەی تێدا دەبینرێت کە دەتوانرێت شوێن پێی هەڵبگیرێت و لەم بوارەدا چاوی لێ بکرێت.

جا هەروەك "فیکر" و "ویجدان" لای نوورسی یەکدەگرن، بە هەمـان جـۆر "زانستە خواییەکان" و "زانستە گەردوونییەکـان"یش لە زەیـن و ویجـدانی ئەودا یەکدەگرن و دەست لە ملی یەکتر دەئاڵێنن، چونکە زانستە گەردوونییەکان لای نوورسی لە ڕاسـتی و واقیعـدا چەنـد زانیـارییەکن لەمەڕ ناسـینی خواوەنـد و، مـرۆڤ بە خـوای گەورە دەگەیەنـن و، لە ڕێـی لێکـۆڵینەوە و بەدواداگەڕان(إستقراء) و تێڕامانەوە نهێنییەکانی بەدیهاتن و مەزنیی پێکهێنـان و بەدیهێنانی گەردوونی بۆ دەردەخەن.

هەروەهـا نـوورسی سەرانسـەری شـتانی نـاو گەردوون - بە هەمەکی و هەنـدەکییانەوە - بە یەك دانە "یەکە"ی ئەوتـۆ دەبینێـت کە یەك یاسـای خـوایی بەسـەریدا زاڵە، کە ئەویـش یاسـای (هاوکـاری و پشـتگیری)یە، نەك یاسـای

(١) بڕوانە: کتێبی (وتەکان) ل: ٢٩٨-٣٠٣. (وەرگێڕ)

(مشتومڕ و ململانێ) وەك هەندێ لە فەیلەسووفەكانی ئەم ڕۆژگارە پێیـان وایە. بۆیە لەم ڕوانـگەیەوە گەردوون هـاوڕێیەكی خۆشەویسـتی مـرۆڤە و یەكتریـان خۆشدەوێت و مرۆڤ هەرگیز هەست بە نامۆیی ناكـات تیایـدا، یـاخود هـیچ بیانوویەكی نییە تا لێی بترسێت و لە دەستی بێزار ببێت! كەواتە پەیوەسـتبوون و پێكەوەگرێدانی دڵـی "مـرۆڤ" و دڵـی "گەردوون" ئەو كـارەیە كە نـووسی لە قوتابخانە ئەدەبییەكەیدا هەوڵی بۆ دەدات.

توندوتیژی و چەسپاویی یاسـاكان - لەم ڕوانـگەیەوە - ئەوە ناگەیەنێـت كە كونـاودەركردن و شـكاندنی زنجیرەكـانی ئەو یاسـایانە كـارێكی مەحـاڵ و لە توانابەدەر بێت، چونكە پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێـت - ئەو یاسـایانەیان شكاندووە، تـاكو بـۆ خەڵكیـی بچەسـپێنن كە ئەم یاسـایانە وەك "خـوایەتی" و "زاڵبوونی پەروەردگارێتیی خواوەنـد" نـین كە دارای چەسـپاوییەكی ئەوتـۆ بـن كەس نەتوانێت بەسەریاندا زاڵ ببێت. هەروەهـا بـۆ ئەوەش كە دەریـبخەن ئەو یاســایانە "بەدیهێــنەر" نــین، بەڵكــو "بەدیهێــنراو"ن و جڵەویــان بە دەســتی بەدیهێنەرەكەیانە، چۆن و چ كاتێك و بە دەستی كام لە بەندەكانی خۆی ویستی لەسەری بێت هەڵیاندەگێڕێتەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهێنێت!

بەم جــۆرە، مــوعجیزە - هاوكــات لەگەڵ ئەركە زانراوەكــانی ئەســتۆیدا - كارمەندییەكی تری بۆ دروست دەبێـت كە ئەگەر خـامەی ئەدیـبێكی كـارامەی خاوەن ئیبداع تاوتوێی بكات، ئەوا دەتوانێـت ئەدەبـێكی ئیمانیـی ئەوتـۆی لـێ بەرهەم بهێنێت كە لەوپەڕی جوانیدا بێت، وەك ئەوەی كە نـوورسی خـۆی لەو پارچە پەخشانەیدا ئەنجـامی داوە كە نـاوی (دەسـتە پیـرۆزەكە)ی لـێ نـاوە و، وەسفی موعجیزاتی دەستی پیـرۆزی پێغەمـبەری ﷺ تێـدا كـردووە كە تاوێـك دوژمنانی بەردەباران دەكات و، تاوێكی تر ئاوی چەشـنی سەلسـەبیل لە نێـوان پەنجەكانیەوە هەڵدەقوڵێت، تـاكو هـاوەڵانی تێرئـاو بكـات و، تـاوێكی تـریش

دەبێت بە مەڵهەمی زامی هاوەڵەکان لە ڕووبەڕووبوونەوەکانی جەنگ و جیهاددا[١]!

هەروەها نوورسی ڕای وایە کە سەرکەوتن و سەربەرزیی "حەق" کارێکی مەحاڵ نییە، بگرە شتێکی بێگومانە. ئنجا ئەو "هێز"ەش کە خۆرئاواییەکان شانازیی پێوە دەکەن، شتێکی ڕەها (مطلق) نییە. چونکە سروشتی هەموو شتێك وایە کە شتانی دژی خۆی لە خۆیدا هەڵدەگرێت! بەو پێیە "هێز"یش تۆوی لاوازبوونی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە و کاتێك دێت کە دووچاری لاوازی دەبێت. هەروەك "لاوازی"یش هەمیشەیی نییە، چونکە گەرای بەهێزبوونی لە خۆیدا هەڵگرتووە و کاتێك دێت کە ببووژێتەوە و هێز پەیدا بکاتەوە..

کەواتە نابێ بەهێزان و خاوەن توانا و دەستەڵاتەکان بەو هێزەیان دڵخۆش ببن و لە بەرچاوی خەڵکیدا پێوەی بنازن و لەو ڕێیەوە خۆیان بەسەریاندا بسەپێنن..

هەروەك نابێ لاوازانیش گرفتاری نائومێدی ببن و بکشێنە دواوە و، ئەو هیوا و ئاواتە لەدەست بدەن کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هێز و دەستەڵات پەیدا بکەنەوە. (حەق)یش - بە بێ گومانی - سەردەکەوێت، گەر گوێڕایەڵی شەریعەتی تەکوینی بێت و لە یاساکانی لانەدات. چونکە هەر تەنها گوێڕایەڵی کردن بۆ شەریعەتی تەکوینی و پابەندبوون بە یاساکانیەوە تاکە ڕێگای "حەق"ە بۆ بەدەستهێنانی ئەو "هێز"ەی پێویستی پێیەتی و، لە گۆڕەپانی ململانێی لەگەڵ "ناحەق"دا یارمەتیی دەدات و پشتی دەگرێت. چونکە هەر ناحەقێك خۆی بە "هێز" پڕچەك کردبێت، بێ هیچ گومانێك، بەسەر ئەو "حەق"ەدا سەردەکەوێت کە ئەو چەکەی پێ نەبێت!

---

(١) بڕوانە: (مەکتووبات) ل: ٢٣٧.(وەرگێڕ)

هەروەها لەم ڕوانگەیەوە دوو هێز دەبینرێن کە هەریەکەیان مێژوو بەلای خۆیاندا کێش دەکەن و دەیجوولێنن، کە بریتین لە "موتڵەق" لە لایەکەوە و "نیسبی"ش لە لایەکی ترەوە. لە پشتی هەردووکیشیانەوە (قەدەر)ی خواوەند هەیە کە دەورەی نیسبی و موتڵەقی داوە و، بازنەی ململانێیان لەگەڵ ڕووداوەکاندا و، نەخشەی بەرپابوون و ڕووخانی شارستانێتییەکانیان بۆ دەکێشێت.

جا ئەم تێگەیشتنە ڕۆحییە لە "مێژوو" یارمەتیی ئەدیبی زیرەك دەدات بۆ دەستنیشانکردنی ڕووداوێکی مێژوویی دیاریکراو، پاشان بۆ کردنی ئەو ڕووداوە مێژووییە بە کار و بەرهەمێکی ئەدەبیی ئەوتۆ هێندە کاریگەریی لە دەروونی مرۆڤدا هەبێت کە خودی ڕووداوەکە یان فیکرە موجەڕڕەدەکەی، ئەو کاریگەرییەی نەبێت!

بەڵام بەشداریی "قەدەر" بە هەرکام لە شێوەکان لە دروستکردنی مێژوودا، ئەوە ناگەیەنێت کە باوەڕ بە جەبرییەتی مێژوو بکرێت بە چەشنێك کە مرۆڤ هیچ سەربەستی و ئیختیارێکی لە دەستدا نەمێنێت. نەخێر.. چونکە ئەم تێگەیشتنە ڕواڵەتی و سەرپێیە لە "قەدەر" پێچەوانەی حەقیقەتە. بۆیە دەبێ مرۆڤی عەوداڵی حەقیقەت گوێ لە "نوورسی" ڕابگرێت کە لەم ڕووەوە گوفتاری ئاراستە دەکات و پێی دەڵێت:

(ئەی عەوداڵی حەقیقەت!

ئەو ڕوانینەی کە شەریعەت سەیری "ڕابوردوو" و "موسیبەت"ی پێ دەکات جیایە لەوەی کە سەیری "داهاتوو" و "گوناهباری"ی پێ دەکات..

ئەوەتا بە چاوی "قەدەری خوای گەورە" بۆ "ڕابوردوو" و "موسیبەتەکان" دەڕوانێت.. قسەی بەجێ لێرەدا هی "جەبرییە"یە!

بەڵام بە چاوی "تەکلیفی خوای گەورە" بۆ "داهاتوو" و "گوناهەکان" دەڕوانێت.. قسەی ڕەوا لێرەدا هی "موعتەزیلە"یە!

بەم جۆرە، موعتەزیلە و جەبرییە لەم خاڵەدا (لەگەڵ حەق) یەکدەگرنەوە.

جـا هەریەك لەم ڕێچـکە ناڕەوایـانە، بە ئەنـدازەی دەنـکە دانەوێـڵەیەك حەقیقەتیان تێدایە و، ئەم حەقیقەتەش شـوێنی تـایبەتیی خـۆی هەیە. نـاحەقی لەوەدایە کە وا بزانرێت سەرجەم بۆچوونەکانی تـری ئەو ڕێچـکەیە ئـاوا دارای حەقیقەت بن)[١]!

کەواتە بـۆ ئەوەی مـرۆڤ خەفەت بـۆ ئەو شـتانە نەخـوات کە لە دەسـتی دەرچوون و، ئازاری ئەو پەژارە و کارەساتانەش نەچێژێـت کە لە "ڕابـوردوو"ی ژیانیـدا هـاتوونەتە ڕێـی، پەنـا بـۆ چارەسـەری "قەدەر" دەبـات تـاکو خەم و ئازارەکانی دەروونی خۆی پێ بشواتەوە. بەڵام کە ڕووبەڕووی کـاتی "ئێسـتا"ی دەبێتەوە و دەشڕوانێتە "ئایندە"ی، نابێ بەو جۆرە بـڕوانێتە قەدەر. بەڵکـو دەبـێ هیممەتی "تەکلیف" و سەربەستیی "ئیختیار"ی تیـژ بکـاتەوە، تـاکو بیـانوو بـۆ هەڵە و تاوانەکانی خۆی نەدۆزێتەوە و بە ناحەق نەیانخـاتە ئەسـتۆی قەدەرەوە! چونکە "بەرپرسیاری" لە ڕاستیدا ئیکسیری ژیانی خـۆیی مـرۆڤە و، بە بـێ ئەوە مرۆڤ "خودی"ی خۆی و واتای ڕاستەقینەی "وجوود"ی لە دەست دەدات.

خۆ ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە قەدەر یارمەتیی نووسـەری شـانۆیی موسـڵمان دەدات و، وێـنەی ژیـانی شـانۆیی بە چەشـنێك بـۆ دەکێشـێت کە دەگـونجێ ئەکتەرەکانی شانۆییەکەی لەو چوارچێوەیەدا بجووڵێنەوە و ژیانێك بەرنەسەر کە دابەش بێـت بەسـەر "ڕابـوردوو" بە هەمـوو یـاد و کـاریگەری و پێکهێـنەرە دەروونییەکانی و.. کاتی "ئێستا" بە گشت ئازار و ئاواتەکانی و.. "ئاینـدە"ش بە هەموو هیوا و ئومێد و ڕۆژە بریسکەدارە چاوەڕوانکراوەکانیەوە.

ڕۆماننووسی موسـڵمانیش بە هەمـان جـۆر سـوود لەم تێگەیشـتنەی قەدەر وەردەگرێـت، چـونکە ئەدیبـی شـانۆیی و ڕۆمـاننووس هەردووکیـان لە ڕێـی ئەکتەرەکان و پاڵەوانەکانیانەوە چارەسەری مەسەلەی قەدەر دەکەن.

---

(١) بڕوانە: ل: (٥٠-٥١)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

پاشان ئەو "ئەدەبی ئیمان"ەی کە نوورسی لەم پەیامەدا بناغەکـانی دانـاوە و نەخشەی بۆ کێشاوە، ئەدەبێکە بایەخ بە واتا مرۆڤایەتییە بڵندەکان دەدات و، بـۆ ئەو چڵەپۆپە بەرزانە دەڕوانێت کە مرۆڤ دەتوانێت بـۆ لایـان سـەربکەوێت و، بەرەو ئەو چەشنە پاڵەوانێتییە دەروونییەش هانی دەدات کە بەسـەر نزمایيەکـانی دەروون و هەوا و ئارەزووەکانیـــدا بەرز ببێـــتەوە و، نەیەڵێـــت ئەو دەروونە لە بەردەم توانا و دەستەڵاتی سامان و فەرج و هێـز و پـلە و پـایەدا، سـەری نەوی بکات!

ئەم ئەدەبە هەردەم بەرزیی خۆی دەپارێزێت و بە هـیچ جۆرێـك دانـابەزێتە ئەو ئاســـتەی کە "لاوازی"ی ئـــادەمیزاد و "ڕۆڵـــیَ" مـــرۆڤ لە ناوەنـــدی خەســـتوخۆڵترین وەهمەکـــانی "ژیـــان" و خـــراپترین درۆ و دەلەســـەکانی "سروشت"دا بتلێنێتەوە و هەرگیز خـۆی بەم دوانە لەکەدار ناکـات، وەك ئەوەی کە ئەدەبی ئەمـــڕۆی خۆرئـــاوا پێـــوەی گرفتـــارە و ســـڵ لە باســـکردنی هـــیچ زۆنگـــاوێکی ئەوتـــۆ ناکـــاتەوە کە مرۆڤـــی تێـــدا نـــوقم ببێـــت، بـــا چەپەڵـــی و بۆگەنییەکەشی لە هەر پلە و ئاستێکدا بێت!

هەروەها ئەو ئەدەبی ئیمانەی کە نوورسی بانگەشەی بۆ دەکات، دەبـێ ئەو گرێکوێرەی "ترس" و "لاوازی"یەش بکـاتەوە کە دەیـان سـاڵی خۆسـەپاندن و زەبر و زەنگـی بیانییەکـان بەسـەر گەلانی موسـڵماندا و بە درێژایـی و پانتـایی جیهانی ئیسلام لە "نەست"ی مرۆڤی موسڵماندا پێکی هێناوە و گرێی داوە.

کەواتە ئەم ئەدەبە لە ڕاسـتیدا ئەدەبی هێـزی دەروونیـیە، بە چەشـنێك کە سەرلەنوێ پێکهاتنی دەروونیی مرۆڤی موسـڵمان ڕێکـدەخاتەوە و، لە چڵـکی تـرس و لاوازی دەیشـواتەوە و، لەو مەترسـییەش تێیـدەگەیەنێت کە دەربڕینـی تـرس و لاوازی هەرگیـز سـۆزی میهرەبـانی و بەزەیـی لای کەسـانی تـر ناورووژێنێت، بەڵکـو دەمـاری خۆسـەپاندن و ملهوڕییـان تێدا دەبزوێنێـت و

ئیشتیهای پەلامـاردان و دڕنـدەییان تێـدا دەهەژێنێـت، ئەوەتـا لە بـڕگەیەکی ئەم پەیامەدا دەڵێت:

(ئەی ترسنۆکی لاواز!

ترس و لاوازیت هیچ سوودێکیان تێدا نییە، تەنانەت زیانیشت پێدەگەیەنن. چـونکە خەڵکیـت لـێ هانـدەدەن و بە گورگـانخواردت دەدەن و ئیشـتیهای دڕندەییان تێدا دەبزوێنن، هەر ئەوەندەی خەڵك بە لاوازی و ترسـنۆکیی تۆیـان زانی، یەکسەر لێت ڕادەپەڕن و لەناوت دەبەن)[1]!

نووسەر لێرەدا یەکێك لە دژوارترین و بێ بەزەییترینی یاسـاکانی "دارسـتانی بەشەری" تۆمـار دەکـات کـاتێ کە "ئـیمان" لەبەر مرۆڤـایەتی دادەماڵرێـت و، وەحشیگەریی ئاژەڵ تیایدا زاڵ و دەمڕاست دەبێت.

خۆ هەرچەند ئێستا لاوازی و کەساسی ئابڵۆقەی موسـوڵمانان و چەنـدین گەلی زۆر و زەبەنـدەی تـری جیهانیـان داوە، کەچـی نووسـەر گەشـبینە و نائومێدی سەری تێناکات و، دەیەوێ "ئەدەبی ئیمان" هیوا و ئومێـد بە دەروونی خەڵکی ببەخشێت و بڵێسەی هێز و سەربەرزی و چـاوەڕوانیی ئاینـدە لە دڵ و گیانەکاندا دابگیرسێنێت، ئەمەش بە هـۆی ئەو گیـانی بـاوەڕ و مـتمانەیەی کە نووسەر هەیەتی بەوەی داهاتوو هی ئیسلام دەبێت!

هەروەهـا پێـی وایە کە ئەم کیشـوەرە لاواز و کـۆتکراوەی ئاسـیا بەدەم بانگەوازی ئیسـلامەوە ڕادەپەڕێـت و کـۆت و زنجیرەکـان دەشـکێنێت و، بە خۆی و زەوی و ئاسمان و خەڵکەکەیەوە تەسـلیمی ئیسـلام دەبێـت، بـاوەشی بەسـۆز و میهرەبـانی ئەم ئـایینەش لە ئـامێزی خـۆی دەگرێـت و، بە دەسـتی ڕاستیشی ئـیمانی پـێ دەبەخشـێت و، ئاسـایش و دڵنیـایی پێشـکەشی گـرۆی مرۆڤ دەکات.

---

(١) بڕوانە: ل: (٧٠)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

جا دوای ئەمەی کە پێش‌چاومان خست و، شـان بە شـانی بڵاوکـردنەوەی گیانی هیوا و ئومێد و گەشـبینی لەنـاو گەلانـدا، یەکێـك لە ئەرکە گرنگەکـانی (ئەدەبی ئیمان) ئەوەیە کە زۆر بە توندی و هێـزەوە بەرەنگـاری ئەو مەترسـییانە ببێتەوە کە پشێوی و ئاشووب دەنێـنەوە و ئاشـتی و ئاسـایشـی کۆمەڵگاکـان دەخەنە مەترسـییەوە و هەڕەشـەی کـاولبوون و دارمـان و نەمـانی لـێ دەکەن. چونکە هەتا ئەو ستەمە ئابوورییەی کە ئەنجـامی لادانە لە دادگەریـی ئیسـلام، لەسەر گەلان لانەبرێت، هیچ هیوا و ئومێدێك بە ژیانی ئاسـوودەیی و ئاشـتی نامێنێت. "نوورسی" لە چەند دێڕێکی کورت و کەمدا ڕەگ و بناغەکانی هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم دیاردەیە دەستنیشان دەکات و، ئنجا بـوار بـۆ ئەوانەی دوای خـۆی بەجێـدەهێڵێت تـاکو درێـژە بەم کـورتە باسـەی ئەم بـدەن و ڕوونکردنەوەکانیانی لەسەر بنیات بنێن، دوای ئەوەش بـۆ ڕووبەڕووبـوونەوە و چارەسەرکردنی لێ ببڕێن و تێبکۆشن. ئەوەتا نوورسی دەڵێت:

(بناغە و کانگای هەموو جۆرەکانی پشێوی و ئاڵۆزی و ناکۆکی و، هۆکار و سەرچاوەی بزوێنەری گشت جۆرەکانی خراپە و ڕەوشـتە نزمەکـان، تەنهـا دوو وشەن یان دوو ڕستەن:

**وشـەی یەکەم:** "گەر من بۆخۆم تێر بم چیم لە خەڵکی داوە، بـا لە برسـاندا بمرن"!

**وشـەی دووهەم:** "تـۆ لە پێنـاوی حەوانەوەی منـدا گیروگرفتەکـانی ژیـان هەڵبگرە.. تۆ کار بکە با مـن بەری ڕەنجـت بخـۆم.. ئەرکی کـار لەسـەر تـۆ و خواردنیش لەسەر من"!

ئەو چارەسەرەش کە دەماری ژەهـرە کوشـندەکەی وشـەی یەکەم لە بـنج و بێخدا دەردەهێنێت، بریتییە لە "زەکاتدان" کە یەکێکە لە پێنج پایەکـانی ئیسـلام. ئەو چارەسـەرەش کە دەمـاری درەختـی زەقـوومی نـاو وشـەی دووهەمـیش ڕیشەکەن دەکات، بریتییە لە "حەرامکردنی سوو"(الربا).

جا ئەگەر گرۆی مرۆڤ حەز بە چاکە و ژیانی بەرز و مەردانە دەکات، دەبێ زەکات فەرز بکات و ڕیباش بە تەواوی لەناودا لا ببات)[١].

جێی خۆیەتی لێرەدا خوێنەر لەوە ئاگادار بکەمەوە کە ئەو بایەخەی نوورسی بە ڕازاندنەوەی "وێنەی ئەدەبی"ی دەدات بە چوارچێوەی وێنەکەی نادات! چونکە ئامانجی ئەو بایەخدانە بە هزر و ناوەڕۆك لە بریی وشە و ڕوخسار. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئاوڕ لە لاوازی و بێهێزیی دارشتنی ئەو دەستەواژانە ناداتەوە کە "هزرەکان"ی خۆی تیایاندا دادەڕێژێت و، هەرگیز خۆی بە ڕازاندنەوەی وشە و دەستەواژەکانیەوە ماندوو ناکات بۆ مەبەستی جوانکردنیان لە بەرچاوی خوێنەردا! بەڵکو تابلێی یەکسەری و کتوپڕییە لە نووسینەکانیدا و، پێی وایە کە وشەکان جگە لە هەڵگر و بارکێشی هزرەکان هیچی تر نین و، ئەگەر هەر "بیر"ێك مەزن و جوان بێت گرنگ نییە چ وشەیەك هەڵیبگرێت، مادەم بتوانێت ئەو بیرەی هەڵیگرتووە بە خوێنەرەکەی بگەیەنێت. کەواتە نووسی ئەدیبی "ئەفکار"ە نەك هی وشە و "ئەلفاظ"!

خۆیشی لە سەرەتای ئەم پەیامەدا ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە، تاکو خوێنەر ئاگادار بێت و بەهەڵەدا نەچێت و بە وردی سەیری گەورەیی فیکرەکە بکات نەك ڕەوانیی دەستەواژەکان، چونکە مەبەست و ئامانجی نوورسی لەم پەیامە و گشت پەیامەکانی تریشیدا بریتییە لە "ئەفکار" نەك وشە و دەستەواژە و ڕوخسار.

ئنجا هەرچەند نوورسی شاعیر نییە، بەو واتایەی کە شیعری نەهۆنیوەتەوە، کەچی لە ناوەندی وشە و گوفتارەکانیدا هەستێکی شاعیرانە بەدی دەکەین، کە ئەمەش دەریدەخات وزەیەکی ئەدەبی و شاعیرانەی لە دەروون و هەناوی خۆیدا حەشار داوە.

---

(١) بڕوانە: ل: (٤٧-٤٨)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

هەموو یەکێك لە بڕگەکانی ئەم پەیامە، هەرچەندەش کەم و کورت بێت، بیرێکی تایبەتیی لەخۆ گرتووە و، هەرکام لەو بیرانەش بە تەنها خۆی دەتوانێت بابەتێکی ویجدانیی ئەوتۆ ئیلهامی خوێنەرەکەی بکات کە بیر و هەستەکانی ببزوێنێت و چەندین وزەی ئیمانیی تێدا پاشەکەوت بکات کە بریسکەی نوور و رووناکییەکانی فریای مرۆڤی ئیماندار بکەوێت کاتێ کە تاریکستانی فیتنە و کارەساتەکان لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقەی دەدەن و دەکەوێتە نێوانیانەوە. ئیتر مرۆڤی ئیماندار بە بەصیرەت و شارەزایی لە کارەکەیدا ڕێی خۆی دەبڕێت و بە لای ڕاست و چەپدا پێی ناترازێت و لەو ڕاستە شەقامە لانادات کە هی ئەوانەیە (أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضَّالِّين)!

ئەوەی شایانی ئاماژەبۆکردنە ئەوەیە کە من لەم پێشەکییەدا تەنها چەند بابەتێکی ئەم پەیامەم پێش‌چاو خستووە و پاشماوەی بابەتەکانی تر و دۆزینەوەی گەوهەری ئەدەب و حیکمەتەکانی ئەم پەیامەم بۆ خوێنەری بەڕێز خۆی بەجێهێشتووە، بە تایبەت ئەو بەراوردەی کە نوورسی لە نێوان ئەدەبی قورئان و ئەدەبی خۆرئاوادا سازی داوە، هەندێ جاریش ناچار بووم پەنا بۆ چەند بڕگەیەکی تری نووسەر ببەم لە پەیامەکانی تریدا تاکو بیر و بۆچوونێکی فراوانتر لەسەر لایەن و ڕەنگە ئەدەبییەکانی نوورسی و جیاوازیی بابەتەکانی ئەو ئەدەبە بخەمە بەرچاوی خوێنەران.

ئومێدەوارم خوێنەری بەڕێز لە ناوەندی دێڕەکانی ئەم پەیامەدا خۆراکێکی خۆش و بەتام و سوودبەخش بۆ "ژیری" و "گیان"ی خۆی بەدەست بهێنێت.

یارمەتی و سەرکەوتنیش هەر تەنها لەلایەن خوای گەورەوەیە.

**ئەدیب ئیبراهیم دەبباغ**

* * *

# چەند بریسکانەوەیەك لە نێوان هەردوو مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان و جەژندا

## چەند گوڵێکن کە لە ناوك و تۆوی حەقیقەتەکانەوە دەمیان پشکوتووە و، دیوانێکی شیعری ئیمانییە بۆ قوتابییانی نوور

**ڕوونکردنەوەیەك:**

ئەم دیوانەی کە ناوی "لوامع"ی لێ نراوە، وەك دیوانەکانی تر لەسەر یەك ڕەوت و یەك شێواز ناڕوات، چونکە دانەری بەڕێز لەم دیوانەدا وتە ڕەوان و پوختەکانی دانراوێکی کۆنی خۆی ڕوون کردووەتەوە و لێکیداوەتەوە کە ناوی: "ناوکەکانی حەقیقەت"ە. ئنجا لەبەر ئەوەی بە شێوازی پەخشان نووسراوە و، جگە لەمەش جڵەو بۆ ئەندێشە شل ناکات و، هەست و نەستە بێ تەرازووەکانیش ناکات بە بناغەی باسەکانی، ئەوا - ئەم دیوانە - تەنها ئەو ڕاستییانەی تێدا جەم کراون کە بە تەرازووی مەنتیق و ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان کێشراون و هەڵسەنگێنراون و، لە ڕاستیدا وانەیەکی زانستی، بگرە دەرسێکی قورئانی و ئیمانییە کە دانەرەکەی بە برازاکەی خۆی و هاووێنەی ئەوی وتووەتەوە کە لەو دەمەدا دەرس و ڕێنماییان لێ وەردەگرت.

مامۆستای بەڕێزمان لە ڕێـژنەی ئـایەتی: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ﴾ (یس:٦٩) بەهرەمەند بووە و بەو ڕێچـکەیەدا هەنگـاوی نـاوە.. لەبەر ئەوە، ئـارەزووی لە هۆنینەوە و وتنی شیعر نەبووە و، هیچ کاتێکی خۆی پێـوە خەریـك نەکـردووە، هەروەك خۆی لەو بێدارییەی سەرەتای کتێبەکەدا ڕوونی کردووەتەوە و ئێمەش بۆ خۆمان پەیمان بەم ڕاستییە بردووە.

ئەم دیوانی پەخشانە شـیعرە، لە ئەنجـامی هەوڵـێکی سـەرومڕ و، تەنهـا لە ماوەی بیست ڕۆژدا، کە هەموو ڕۆژێك دوو سەعات یان دوو سەعات و نیوی دەخایاند، نـووسراوە و دانـراوە! هەرچەنـدەش دانەر لەو دەمەدا گەلـێ کـار و ئەرکی مەزن و گرنگی "دار الحكمة الاسلامية"ی لە ئەستۆدا بووە. جـا دانـانی کتێبێکی بەو جۆرە لە ماوەیەکی یەکجار کورت و کەم خایەندا، وێڕای سەختیی نووسینی یەك لاپەڕەی هۆنراو کە بە ئەندازەی دە لاپەڕەی پەخشـان قورسـە و، سەرباری ئەوەش کە بە چەشنێکی سروشتی واتاکان بۆ دڵی هـاتوون و پاشـان دەستکاری نەکردنی ئەو ڕەوتە سروشتییەش بۆ مەبەستی لە چاپـدانی.. هەمـوو ئەمـانە، وامـان لـێ دەکەن کە ئەم دیـوانە بە یەکێـك لە کـارە دەراسـاکانی "پەیامەکانی نوور" دابنێین و، هـیچ دیـوانێکی تـری شـیعر شـك نـابەین کە بە وێنەی ئەم دیوانە بتوانرێت بە ئاسـانی و بـێ تەکەللـوف لە شـێوەی پەخشـاندا بخوێنرێتەوە.

لە خـوای گەورە داواکـارین ئەم کتێـبە بەنـرخە وەك مەسـنەویی مەولانـای ڕۆمی لێ بکات بـۆ قوتابییـانی نـوور. چـونکە پـوختە و کـورتەیەکی بەپێـز و بەهـاداری پەیامەکـانی نـوورە و لە حـوکمی پێڕسـتێکدایە مـژدەی هـاتنی ئەو پەیامانەی پێیە کە پاش تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر نووسینی ئەم دیـوانەدا هـاتنە گۆڕێ و، لە ماوەی بیست و سێ سـاڵی ڕەبەقـدا بە تەواوی و کـامڵی کەوتـنە بەردەستی خوێنەران.

لە قوتابییانی نوور:

**صونگور، محەممەد فەیزی، خەسرەو**

## بێدارکردنەوەیەك[1]:

لەم دیوانەدا ڕێزی شایانم لە "هۆنین" و "سەروا" نەناوە، چونکە شارەزایان نیم و، وەك وتراویشە: (مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت)!

نەیشمویست وێنە و شێوەی "ڕاستی" بگۆڕم تاکو لەگەڵ ئارەزووی سەروا(قافیة)دا بگونجێ، بە چەشنی "بەختکردنی صافیە لە پێناوی قافیە"دا[2]!

هەر بۆیە لەم کتێبە دوور لە "هۆنین" و "سەروا"یەدا بێکەڵکترین پۆشاکم کردووەتە بەر لەشولاری بەرزترین "ڕاستی"! چونکە:

**یەکەم:**

من لەمە باشتر نازانم. لەبەر ئەوە، بیری خۆم بە چڕی تەنها ئاراستەی واتاکان دەکرد، نەك وشە و ڕووی ڕواڵەتی..

**دووهەم:**

ویستم، بەم شێوازە، ڕەخنەی خۆم بەرامبەر بەو شاعیرانە دەرببڕم کە لە "جەستە" دادەتاشن تاکو لەگەڵ "بەرگ و پۆشاك"دا بیگونجێنن!

---

(١) تێبینی: ئەم دیوانە لە پەخشانچووە، دواهەمین دانراوەکانی "سەعیدی کۆن"ە و، لە ساڵی ١٣٣٧ (١٩٢١ز) لە چاپی داوە و بڵاوی کردووەتەوە. ئنجا پاش دانان و بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور وەسیّتی بۆ قوتابییانی کردووە کە ئەم دیوانە - دوای کەناردانی چەند بڕگەیەکی - بخەنە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "وتەکان"ەوە. پاشان لە سەرەتای ساڵەکانی پەنجادا چەند پەراوێزێکی نوێی بۆ دانا و فەرمانی دا بەم شێوەیەی ئێستای بڵاو بکرێتەوە. (وەرگێڕی چاپە عەرەبییەکە)

(٢) پەندێکی تورکییە. دەڵێن پیاوێك خەریکی دانانی شیعرێك بوو، ڕستەیەکی لە شیعرەکەدا بەکارهێنا کە تەڵاقی (صافیة)ی هاوسەری پێ کەوت و لە پێناوی (قافیة)دا خێزانەکەی بەخت کردا! (وەرگێڕی چاپە عەرەبییەکە).

سێهەم:

ویستم لەم مانگی ڕەمەزانە پیرۆزەدا بە چەشنی "دڵ"م، "دەروون"یشم بە ڕاستییە بەرز و بڵندەكانەوە سەرقاڵ بكەم..

لەبەر هەموو ئەم هۆكارانە، لەم دیوانەدا ئەم شێوازە هەڵبژێررا كە لە شێوازی ئەو كەسانە دەچێت لە قۆناغە سەرەتاییەكانی شیعر نووسیندان!

بەڵام خوێنەری بەڕێز!

ئەگەر من هەڵەم كردبێت - كە دان بەو هەڵەیەشمدا دەنێم - نەكەی تۆش بە هەڵەدا بچیت و سەیری شێوازە شڕ و شێواوەكەم بكەیت و، سەرنج لە ڕاستییە بڵندەكانی ناوی نەدەیت و، بە كەم و ناتەواویان ببینیت!

* * *

# گەیاندنی مەبەست

خوێنەری بەڕێز!

پێشەکی من دان بە بێزاریی خۆمدا دەنێم لە دەست هەژاریی توانا و لێهاتنەکانم لە بواری سنعەتی نووسین(الخط) و هونەری هۆنینەوەی شیعردا. ئەوەتا هەتاکو ئێستا ناتوانم بە جوانی و ڕێکی تەنانەت ناوی خۆیشم بنووسم و، لە درێژایی ژیانیشمدا نەمتوانیوە یەك دێڕە شیعر، یان شتێك لەسەر کێشی دێڕە شیعرێك بهۆنمەوە.

کەچی لەپڕ ئارەزوویەکی توند و بەتینی "هۆنینەوە" زۆری بۆ "بیر"م هێنا و، زووتریش "گیان"م بەو هۆنینەوە سروشتییەی بەیتی "قەولی نەوالا سیسەبان"[1] دەکرایەوە کە چەند مەدح و ستایشێکە لە وەصفی غەزای هاوەڵە بەڕێزەکان دەدوێت، خوایان لێ ڕازی بێت. منیش شێوازی هۆنینەکەی ئەوم بۆ خۆم هەڵبژارد و پەخشانێکی لە شیعرچووم نووسی..

ئنجا بە هیچ جۆرێکیش زۆرم لە خۆم نەکرد تاکو کێشی شیعریی بۆ بەکار بهێنم، کەواتە هەرکەس حەزی لێیە با بە نیازی پەخشان بیخوێنێتەوە بێ ئەوەی شیعر بە بیر و ئەندێشەیدا بێت یان بایەخی پێ بدات، بەڵکو باشتر وایە بە پەخشانی دابنێت، بۆ ئەوەی لە واتاکانی تێبگات، چونکە بڕگە و پارچەکانی لە واتادا هاوپەیوەندین، هەروەها دەبێ لە سەروا(قافیة)کانیشدا ڕانەوەستێ[2]،

---

(١) پارچە شیعرێکی دوور و درێژی چوارسەد بەیتییە لە وەسفی غەزاکانی هاوەڵاندا - خوایان لێ ڕازی بێت - مەلا خالید ئاغای زێباری - کە بە زوهد و تەقوا بەناوبانگ بووە - بە ڕێنچکە زمانی کوردیی کرمانجی ژووروو هۆنیویەتیەوە. (وەرگێڕی چاپە عەرەبییەکە)

(٢) لە وەرگێڕانی ئەم دیوانەدا خوای گەورە یارمەتی و تەوفیقی ئێمەشی بە شێوەی "پەخشان" دا و، وەك چاپە عەرەبییەکە تەنها لایەنی واتامان ڕەچاو کرد، نەك کێش و سەروا. (وەرگێڕ)

چونکه هەروەك دەکرێ کڵاو و تەربووش بێ (گـوڵنگه) بـن، به هەمـان جـۆر دەشکرێ کێشی بێ سەروا و هۆنینی بێ قاعیدەش هەبێـت! تەنـانەت مـن لەو باوەڕەدام که ئەگەر وشه و هۆنینەوه له ڕێی تەکەللوف و خۆ پێ ماندووکردنەوه وایـان لـێ هاتبێـت سـەرنج ڕابکێشـن، ئەوا بیـری مـرۆڤ به خۆیـانەوه - نەك واتاکانیان - سەرقاڵ دەکەن. کەواته باشتر وایه "وشه"(اللفظ) ساکار و دوور له ڕازانەوه و ئارایشت بێت، تاکو ئاوڕی بایەخپێدانی بۆ لا نەدرێتەوه.

مامۆستا و ڕابەرم لەم کتێبەدا: قورئانی پیرۆزه..

ئەو کتێبەش که له بەردەممدایه و لێی دەخوێنمەوه: ژیانه..

ئەو کەسەش گوفتارەکانمی ئاراسته دەکەم: دەروونی خۆمه..

تۆیش - ئەی خوێنەری بەڕێز! - له گوێبیست زیاتر نییت. خۆ گوێبیسـتیش مافی ڕەخنەی نییه؛ چیی پێ باشه وەریدەگرێت و، هەرچیشی پێ باش نەبێت، کاری به سەریەوه نییه و لێی نادوێ.

جـا لەبەر ئەوەی ئەم کتێبـەم له ڕێـژنەی ئەم مـانگه پیـرۆزەوه (مـانگی ڕەمەزان)[١] هەڵقوڵاوه، ئەوا ئومێـدەوارم له دڵـی بـرای ئایینیمـدا کـاریگەریی ببێت و، له پاشمله دوعایەکی لێخۆشبوونم بۆ بکات یان سـوورەتی "فاتیحـه"م بۆ بخوێنێت.

* * *

(١) تەنانەت مێژووی دانانی ئەم کتێبه لەم دەستەواژەیەی خوارەوەدا دەرکەوت:

(نجمُ أدبٍ وُلِدَ لهلاليْ رمضان)!

که کۆی ژمارەی پیتەکانی ئەم ڕستەیه دەکاته: ١٣٣٧ که ساڵی دانانی ئەم دیوانەیه! (دانەر)

## الداعی[١]

گڵکۆی ڕووخاوم[٢] حەفتا و نـۆ تەرمـی[٣] سـەعیدی گوناهبـار و لەش بەئازاری لە ئـامێز گرتـووە و، هەشتاهەمینیشـیان بـووە بە کـێلی گۆڕەکەم.

هەر هەمووشیان، ئەسرین بۆ زایەبوونی ئیسلام هەڵدەڕێژن[٤]..

سـەرجەم تەرمەکـانی نـاو ئەو گـۆڕە پـڕ لە مـردووەم، لەگەڵ کێلەکەیـدا، لە پـڕمەی گریانـدان. سـبەینێش بە پەلە و خێـرا ڕووە و گۆڕەپانی ئەودنیا هەنگاو دەنێم.

لەو دڵنیاییەشـدام کە پاشـەڕۆژی ئاسـیا، بە زەوی و ئاسـمانیەوە، تەسلیمی "دەستی سپی"ی ئیسلام دەبێت.

چونکە دەستی ڕاستی ئیسلام بەرەکەتی ئیمانی تێدایە و..

دڵنیایی و ئاسایش بە خەڵکی دەبەخشێت.

---

(١) ئەم پارچەیە ئیمزایەتی. (دانەر)

(٢) شایانی باسە کاربەدەستانی تورکیا چوار مانگ دوای کۆچی دوایی دانەر، تەرمەکەیان لە گۆڕەکەی دەرهێنا و لە جێگایەکی نادیار و نەزانراودا ناشتیانەوە! (وەرگێڕ)

(٣) واتە لە یەك ساڵدا دوو "سەعید" دەمرن، چونکە لە ماوەی ساڵێکدا دوو جـار لەش نـوێ دەبێـتەوە. سـەرەڕای ئەوەش کە دەریـدەخات سـەعید تـا ئەم بەرواره، واتە ئەم سـاڵە دەژی، چونکە هەموو ساڵێك سەعیدێك دەمرێت(*). (دانەر)

(*) ئەم بڕگـانەی کە بەم نیشـانەیە (*) کۆتاییـان پـێ دێـت، دانەر بـۆ خـۆی لە دوای سـاڵی ١٩٥١زدا زیادی کردوون. (وەرگێڕ)

(٤) بە "هەسـتی پـێش ڕوودان" بیسـت سـاڵ پـێش ڕوودانی ئەم بارودۆخـانە، هەسـتی بە ڕوودانیان کردووە. (دانەر)



الحمد لله ربّ العالمين والصلاه والسلام على سيد المرسلين
وعلى آله وصحبه أجمعين.

## دوو بەڵگەی مەزنی تەوحید

❐ ئەم گەردوونە هەر بۆ خۆی بەڵگەیەکی مەزنە.

چونکە زمانی جیهـانی پەنهان(الغیـب) و زمـانی جیهـانی بینراو(الشـهادة) هەردووکیان بە تەوحیدی خواوەندی میهرەبانەوە سەرگەرمی تەسـبیحاتن و، بە دەنگێکی زوڵاڵی یەکجار بڵند زیکری: "لا إلٰه إلاّ هو" دەڵێنەوە.

ئەوەتا سەرجەم گەردیلە و خانە و گۆشە و ئەنـدامەکانی گەردوون هەمیشـە لەگەڵ گرمەی دەنگی زیکری: "لا إلٰه إلاّ هو"دا بەشدارە و زمانی پاراوە.

هەرچەندەش ئەو زمانانە جۆراوجـۆرن و ئەو دەنگـانەش پـلە پـلەن، بەڵام هەر هەموویان پێکەوە بە یەك دەنگ دەڵێن: "لا إلٰه إلاّ هو".

ئەم گەردوونە مـرۆڤێکی لە ئـادەمیزاد مەزنـترە و، بە دەنگـێکی بەرز یـادی پەروەردگـــاری دەکـــات و، دەنـــگە نەرم و وردەکـــانی بەش و پـــارچە و گەردیلەکانیشی، تێکڕا لەگەڵ ئەو دەنگە بە خوڕەدا، دەڵێن: "لا إلٰه إلاّ هو".

بەڵێ، ئەم جیهانە لە ناوەندی کۆڕێکی مەزنی زیکردا، ئایەتەکـانی قورئـانی پیرۆز دەخوێنێت.

جا ئەم قورئانە ڕۆشن و ڕوونـاکی بەخشـەش، هـاودەم لەگەڵ سـەرجەمی گیانلەبەراندا، "لا إلٰه إلاّ هو" دووپات دەکاتەوە و دەیڵێتەوە.

❐ ئنجـا ئەم قورئـانە حەکـیمەش بەڵـگەیەکی گۆیـای ئەو تەوحیـدەیە و، سەرجەم ئایەتەکانی چەند زمانێکی ڕاستگۆ و تیشـکی پرشـنگداری ئیمانن و، هەموو پێکەوە زیکری: "لا إلٰه إلاّ هو" دەڵێنەوە.

خۆ ئەگەر گوێی خۆت بە سنگی ئەم قورئانەوە بنووسێنیت، ئەوا بێ هیچ گومانێك لە قووڵایی ناخیەوە زایەڵەیەكی ئاشكرای ئاسمانی دەبیستیت كە "لا إله إلاّ هو"ی لێ بەرز دەبێتەوە..

ئەو دەنگە نیانە، دەنگێكی بەرز و بڵندە و لەوپەڕی جددییەت و ئونس و ڕاستی و ئیخلاسدایە و، بە چەندین بەڵگەی قەناعەت بەخشی بەهێز پشتی گیراوە و، بەردەوام "لا إله إلاّ هو" دووپات دەكاتەوە..

ئەم بەڵگە ڕۆشنایە، هەر شەش لاكانی ڕوون و خاوێنن؛ چونكە:

مۆری ئیعجازی لە "سەر" نەخشاوە و..

لە "ناوی"یشیدا نووری هیدایەت دەبریسكێتەوە و دەڵێت: "لا إله إلاّ هو"..

تانوپۆی بەڵگەی مەنتیقیی لە "ژێر"دایە و..

بە لای "ڕاست"یشی عەقڵان دەخاتە گوفتار و، تەسدیقیان بەدەست دەهێنێت و، دەمیان بە "لا إله إلاّ هو" دەكاتەوە.

لای "چەپ"یشی، كە ڕاستە، بەدەستهێنانی شایەتیی ویژدانە..

"بەردەم"یشی خێر و جوانییە و..

"ئامانج"یشی بەدەستهێنانی بەختەوەرییە و، ئەو كلیلەش كە هەمیشە بۆ ئەم مەبەستە بەكاری دەهێنێت بریتییە لە: "لا إله إلاّ هو".

لای "پشتەوە"شی، كە بەردەمە، واتە: پاڵپشتەكەی، شتێكی ئاسمانییە، كە "وەحی"ی پەتی و ئاشكرا و ڕوونە.

جا ئەم شەش لایە، هەر هەموویان، ڕۆشنا و ڕووناكی بەخشن و لە هەموو بورجەكانیاندا "لا إله إلاّ هو" دەدرەوشێتەوە..

ئیتر چۆن "وەهم" دەتوانێت لەو ئاسمانەدا بە پەنامەكی گوێ ڕابگرێت؟ یان چ "گومان"ێك بۆی هەیە توخنی بكەوێت؟

ئایا دەگونجێ ئەو لە ڕێ لادەرە خۆی بكات بەناو كۆشك و تەلارێكی ئاوا پرشنگدار و ڕووناكی بەخشدا؟!

خۆ شوورای سوورەتەکانی گەلێ بڵندن و، هەموو وشەکانیشی فریشتەی دەم پاراون بە زیکری: "لا إله إلاّ هو".

جا ئەم قورئانە مەزنە، دەریایەکی ئەوتۆیە کە "تەوحید" ڕادەگەیەنێت.

دەبا دڵۆپێك لەو دەریایە "وەك سوورەتی ئیخلاص" بە نموونە وەربگرین و، بە وێنەی هێمایەکی نێوان هێما لەژمارەبەدەرەکانی لێی بدوێین:

ئەم سوورەتە، بەوپەڕی تونـدی، هەموو جۆرەکانی شیرك پووچەڵ دەکاتەوە و، لە شەش ڕستەکەیدا حەوت جۆر تەوحید دەچەسپێنێت؛ سێ ڕستەیان "موسبەت" و سیانەکەی تریان "مەنفی"ن..

ڕستەی یەکەم: ﴿قُلْ هُوَ﴾ ئاماژەیەکی بێ نیشانە(قرینة)یە، واتە دەستنیشانکردنێکی ڕەهایە. جا لەو دەستنیشانکردنەدا خۆ دیاریکردن(تَعَيُّن) هەیە. واتە: "لا هو إلاّ هو". کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ "تەوحیدی شهوود". چونکە ئەگەر بەسیرەتی تیژی حەقبین لە تەوحیددا ڕۆبچێت، دەڵێت: "لا مشهودَ إلاّ هو".

ڕستەی دووهەم: ﴿اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بە ڕاشکاوی "تەوحیدی ئولووهییەت" دەردەبڕێت، چونکە حەقیقەت بە زمانی "حەق"ەوە دەڵێت: "لا معبودَ إلاّ هو".

ڕستەی سێهەم: ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ ڕشتەی دوو مرواریی تەوحیدە:

**یەکەم:** "تەوحیدی ڕبووبییەت". چونکە زمانی ڕێسای گەردوون دەڵێت: "لا خالقَ إلاّ هو"..

**دووهەم:** "تەوحیدی قەیوومییەت". واتە زمانی پێویستیی هەموو گەردوون بۆ کاریگەر(مؤثر)ێك دەڵێت: "لا قيّومَ إلاّ هو"..

ڕستەی چوارەم: ﴿لَمْ يَلِدْ﴾. "تەوحیدی جەلال"ی تێدا حەشار دراوە و دەست بە ڕووی گشت جۆرەکانی شیرکەوە دەنێت و دوای کوفر دەبڕێت، چونکە بێگومان ئەو کەسەی ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت و زاوزێ بکات و بەش بەش ببێت، هەرگیز بە قەیوم و بەدیهێنەر و خوا دانانرێت.

﴿لَمْ يَلِدْ﴾ چەمکی کوڕخستنەوە و وەچە لێ بوونەوە پووچەڵ دەکاتەوە. چونکە بە تەواوەتی شیرکی کوڕایەتیی عیسا و عوزەیر (دروودیان لەسەر بێت) و مەلائیکەت و ژیرییەکان لەتوپەت دەکات. ئەوەبوو گەلێ کەس لەم ڕێگایانەوە گومڕابوون و بۆ ناو هەڵدێری ئەم جۆرە شیرکەی گومڕایی بەربوونەوە.

ڕستەی پێنجەم: ﴿وَلَمْ يُولَدْ﴾ تەوحیدێکی سەرمەدییە، ئاماژە بۆ چەسپاندنی "تەنیایی" خوای گەورە دەکات..

چونکە ئەو کەسەی کە "واجب و ئەزەلی" نەبێت، واتە بەپێی کات تازە پەیدا بووبێت، یان لە مادده بووبێتەوە، یان لە ئەسڵێك جیا بووبێتەوە، هەرگیزاو هەرگیز ناکرێ خوای ئەم گەردوونە بێت!

ئەم ڕستەیە، شیرکی هۆکارپەرست و ئەستێرەپەرست و بتپەرست و سروشتپەرستان پووچەڵ دەکاتەوە..

ڕستەی شەشەم: ﴿وَلَمْ يَكُنْ﴾ تەوحیدێکی گشتی و هەمە لایەنەیە. واتە: نە لە زاتیدا و نە لە کردارەکانیدا و نە لە سیفەتەکانیدا شەریك و هاوتا و هاووێنەی نییە. هەموو ئەمانەش پێکەوە هەڵشێلراون و، ڕوویان لە ﴿لَمْ﴾ی ئەم ڕستەیەیە.

ئەم شەش ڕستانە، حەوت پلەیان لە پلەکانی تەوحید تێدایە، کە هەر یەکەیان ئەنجامی ئەوانی ترە و لە هەمان کاتیشدا بەڵگەیانە.

واتە سوورەتی "ئیخلاص" سی سوورەتی ئیخلاصی ڕێکوپێکی لە بەڵگە پێکهاتووی تێدایە، کە یەکتر دەچەسپێنن.

لا يعلَمُ الغيبَ إلاّ اللّٰه.

* * *

## هۆکارەکان تەنها ڕواڵەتین

"عیــززەت" و "مەزنێتــی"ی خــوای گەورە داخــوازی ئەوەن کە هۆکــارە سروشــتییەکان لە بەرچــاوی ژێریــدا بــبن بە پەردەی ڕووی توانســتی خــوای گەورە..

هەروەهــا "تەوحیــد" و "شــکۆمەندی"ی خواوەنــدیش داخــوازی ئەوەن کە هۆکارە سروشتییەکان کاریگەریی ڕاستەقینەیان لەنــاو ئاســەوارەکانی توانســتی خوادا نەبێت[1].

* * *

## "بوون" تەنها بە جیهانی ماددییەوە بەند نییە

جۆرە لە ژمارە نەهاتووەکانی "بوون" تەنها بەم جیهانە "بینراو"ەوە بەند نــین، چونکە جیهانی بەرجەستەی "ماددی" وەك پەردەیەکی نەخشــاوی ڕەنگــین وایە کە بەسەر جیهانە ڕووناکەکانی "غەیب"دا دادراوەتەوە.

* * *

## "یەکبوون"ی قەڵەمی توانست "تەوحید" ڕادەگەیەنێت

دەرکەوتنی جێدەستی داهێنان(الإبداع) لە هەموو گۆشەیەکی سروشــتدا، بە ڕوونی، دەســــت بە ڕووی ئەو گــــریمانەوە دەنێــــت کە هۆکارەکــــان بەدییــــان هێنابێت..

نەخشی هەمان قەڵەم و هەمان توانستیش لە گشت خــاڵێکی بوونەوەرانــدا، بە ئاشکرا و بەڵگەنەویستی، بــوونی هۆکــارە ناوەنــدەکان(الوسـائط) پــووچەڵ دەکاتەوە.

* * *

---

(١) واتە: هەرگیز خۆی لە قەرەی بەدیهێنان و کاریگەری(تأثیر)ی ڕاستەقینە نەدات. (دانەر)

## هیچ شتێك بە بێ سەرجەمی شتانی تر نایەتەدی

نهێنیی "پشتگیری" و "هاوپەیوەندێتی" کە لەناو سەرجەمی بوونەوەراندا حەشار دراوە و بڵاوبووەتەوە.. هەروەها ژیانەوەی گیانی "هاوکاری" و "بەدەم یەکترەوە چوون" لە هەموو لایەکی بوونەوەراندا.. بە ڕوونی دەریدەخات کە:

تەنها توانستێکی گشتلایی جیهانگیرە کە "گەردیلە" بەدی دەهێنێت و لە شوێنی شیاوی خۆیدا دایدەنێت..

چونکە هەموو پیت و دێڕێکی کتێبی گەردوون، زیندوون.. "پێویستی" دەیانخاتە گەڕ.. بە یەکتریان دەناسێنێت.. هەریەکەیان بەدەنگ بانگەوازەوە دەڕوات، لە هەر گۆشەیەکەوە ئاراستەی بکرێت.

هەروەها بەهۆی نهێنیی "تەوحید"ەوە سەرجەم ئاسۆکان بەدەم یەکترەوە دەڕۆن و هاوکاریی یەکتری دەکەن، چونکە "توانست" ڕێنمایی هەموو پیتێکی زیندوو دەکات لە شوێنی خۆی لە هەموو ڕستەیەکدا.

* * *

## بزووتنی خۆر لەبەر کێش(جازبییەت)ە و، ئەویش لەبەر توندڕاگرتنی کۆمەڵەکەیەتی

"خۆر" درەختێکی بەرداره؛ ڕادەپەڕێت تاکو "بەر"ی هەسارە گەڕۆك و کەمەندکێشەکانی دانەکەون! خۆ ئەگەر لە شوێنی خۆیدا ڕابووەستایە و نەجووڵایە، ئەو کێشەی نێوان خۆی و هەسارەکان نەدەما و مەستییەکەشیان کۆتایی پێ دەهات و، هەسارە کەمەندکێش و ڕێك و بڵاوەکانی ناو بۆشایی فراوانی ئاسمانیش، لە تاسەی ئەودا، بەکوڵ دەیاندایە پڕمەی گریان!

* * *

## شتە بچووکەکان پەیوەستی شتانی گەورەن

ئەو کەسەی چاوی مێشوولەی بەدیهێناوە، هەر ئەوە کە خۆر و گەلەستێرەی ڕێی کاکێشانیشی دروست کردووە.. ئەو کەسەی گەدەی کێچی ڕێکخستووە، هەر ئەویشە کە ڕێکوپێکی و ڕێسای بە کۆمەڵەی خۆر بەخشیوە.. ئەو کەسەی "بینین"ی لەناو چاودا داناوە و "پێویستی"ی لەناو گەدەدا داکوتاوە، هەر ئەوە کە چاوی ئاسمانی بە کلی "ڕووناکی" ڕشتووە و، سفرەی خواردەمەنییەکانیشی لەسەر ڕووی زەویدا ڕاخستووە.

* * *

## ئیعجازێکی مەزن لە توێی هۆنینەوەی ڕێسای گەردووندا هەیە

سەیری "ئیعجاز" لە دانان و هۆنینەوەی گەردووندا بکە. ئەوەتا گەر بە فەرزی مەحاڵیش وا دابنرێت کە هەموو یەکێك لە هۆکارە سروشتییەکان بکەر و خاوەن ویست و ئیختیار و تواناش بن، ئەوا هەر هەموویان بە ملکەچی و دەستەوسانی لە بەردەم ئەو ئیعجازەدا سوژدەیان دەبرد و دەیانوت: "سُبْحَانَكَ.. لا قُدْرَةَ فِيْنَا.. رَبَّنَا أَنْتَ الْقَدِيْرُ الأَزَلِيُّ ذُو الْجَلالِ"!

* * *

## هەموو شتێك لە بەردەم توانستی خوادا یەکسانە

﴿ما خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (لقمان: ٢٨).

توانستی خواوەند خۆیی(ذاتي) و ئەزەلییە؛ هەرگیز کۆڵەواری(العَجْز) ئاوێتەی نابێت. کەواتە نە پلەپلەیە و نە ڕێگر و تەگەرەشی تێکەڵ دەبێت. بەڵکو گەورە و بچووك، کوللی و جوزئیی لەلا یەکسانە و لەچاو ئەودا جیاوازییان نییە، چونکە هەموو شتێك پەیوەستی سەرجەمی شتانی ترە.

کەواتە ئەو کەسەی کە نەتوانێت هەموو شتان بەدی بهێنێت، هەرگیز ناتوانێت تەنانەت یەك شتیش بەدی بهێنێت!

* * *

## ئەو کەسەی جڵەوی سەرجەمی گەردوونی بەدەست نەبێت، ناتوانێت یەك دانە گەردیلەش بەدی بهێنێت!

ئەو کەسەی خاوەنی دەستێکی وەها نەبێت کە گۆی زەویمان و خۆر و ئەستێرە لە ژمارەبەدەرەکانی پێ هەڵبگرێت و، بە ڕێکی و ڕێسا و وردەکاری، لەسەر سنگ و ئەستۆی بۆشایی ناو ئاسماندا دایانبنێت، هەرگیز مافی ئەوەی نییە کە لافی دروستکردن و بەدیهێنان لێ بدات!

زیندووکردنەوەی "جۆر" وەك زیندووکردنەوەی "تاك" وایە..

هەروەك زیندووکردنەوەی مێشێك، کە لە وەرزی زستاندا نوقمی خەوێکی چەشنی مردن بووە، لە توانستی خوای گەورەدا کارێکی گران نییە.. بە هەمان جۆر، زیندووکردنەوەی ئەم دنیایە لە دوای مردنی، تەنانەت زیندووکردنەوەی سەرجەمی گیانلەبەران، بە لای ئەو توانستەوە سووك و ئاسانە.

* * *

## "سروشت" بەدیهاتوویەکی خوای گەورەیە

سروشت:

چاپکەر نییە.. بەڵکو ئامێری لەچاپدانە..

نیگارکێش نییە.. بەڵکو نەخشونیگارە..

بکەر نییە.. بەڵکو دارای توانا و لێهاتنی کارتێکردنە..

سەرچاوە نییە.. بەڵکو ئامرازی پێوانەی شتانە..

ڕێکخەر و ڕێساساز نییە.. بەڵکو ڕێسایە..

توانست نییە.. بەڵکو یاسایە..

کەواتە "سروشت" یاسایەکی ویستی خوای گەورەیە و، خاوەنی حەقیقەتێکی دەرەکی نییە.

* * *

## ویژدان بە جەزبە و مەستیی خۆی خوای گەورە دەناسێت

لە ویژدان(وجدان)ی مرۆڤدا کێشبوون و ڕاکێشان(انجذاب و جذب)ێك هەیە کە هەمیشە تیایدا تێکەڵ بوون و پێکەوە گرێ دراون. هەر لەبەر ئەوەشە کەمەندکێش دەبێت، خۆ دیارە کێشبوونیش دەبێ بە کاری بکێشێك ئەنجام بدرێت!

مرۆڤی خاوەن هەست و شعوور، هەر کاتێ بە ڕوونی و بێ پەردە خاوەنی جوانی ببینێت، جەزبە دەیگرێت و دڵی بۆی دەشنێت..

جا ئەم سروشتە هەستیارە، بەڵگەیەکی گومانبڕ لەسەر خواوەندی "واجب الوجود" پێشکەش دەکات. شایەتی یەکەمی لەمەدا: ئەو ڕاکێشانەیە و، شایەتی دووهەمیشی: ئەم کێشبوونەیە!

* * *

## شایەتیدانی فیطرەت شایەتییەکی ڕاستە

"فیطرەت"(سروشت) درۆ ناکات، هەرچییەك دەڵێت ڕاستە. بۆ نموونە: مەیل و ویستی گەشەکردنی ناو "تۆو" دەڵێت: (گەشە دەکەم.. بەر دەگرم). واقیعیش ڕاستیی قسەکەی دەسەلمێنێت..

مەیلی ژیان لەناو قووڵایی ناخی "هێلکە"دا دەڵێت: (دەبم بە جووجك).. بە ئیزنی خوای گەورە دەبێت بە جووجك و کردار تەسدیقی گوفتارەکەی دەکات..

گەر لەوێچێك ئاو لەناو تۆپێکی ئاسنینی داخراودا بیەوێت ببەستێت، ئەوا مەیلی بڵاوبوونەوەی ئەو ئاوە لە دەمی ساردبوونیدا، بەو ئاسنە دەڵێت: (ڕێم بدە و فراوان ببە، من پێویستم بە جێیەکی فراوانتر هەیە)! ئەو ئاسنە ڕەق و تەقە هەوڵ دەدات کە بەدرۆی نەخاتەوە. تەنانەت ئیخلاس و ڕاستیی ناو دەروونی ئاوەکە ئەو ئاسنە شەق دەکات و جێی خۆی تێدا دەکاتەوە!

جا هەموو یەکێك لەم مەیلانەی کە باس کران، فەرمانێکی تەکوینی و، حوکمێکی خواوەند و، شەریعەتێکی فیطرین، "ویست"ی خوای گەورە لە بەڕێوەبردنی گەردووندا، دەردەخەن. کەواتە هەموو "مەیل" و گشت "گوێڕایەڵی"یەك ملکەچکردنە بۆ فەرمانێکی تەکوینیی خواوەند.

تەجەللیی ناو ویژدانیش درەوشانەوەیەکی وەکو ئەمانەیە، بە ڕادەیەك کە کێشبوون و ڕاکێشانی ناو ئەو ویژدانە بە چەشنی ئاوێنەی ساف و خاوێن، ڕوون و نمایانە و، نووری ئیمان و درەوشانەوەی جوانیی هەمیشەییان تێدا دەدرەوشێتەوە.

* * *

## "پێغەمبەرێتی" بۆ گرۆی مرۆڤ شتێکی پێویستە

ئەو توانستە خواییەی کە مێروولە بەبێ سەرکردە و هەنگیش بەبێ شاژن ناهێڵێتەوە، هەرگیز گرۆی مرۆڤیش لە پێغەمبەر و شەریعەت بێبەش ناکات..

بەڵێ، نهێنیی ڕێسای جیهان وا دەخوازێت.

* * *

## میعراج موعجیزەیەکی پێغەمبەرە ﷺ بۆ مەلائیکەت، هەروەك لەتبوونی مانگ موعجیزەیەك بوو پیشانی گرۆی مرۆڤ درا

میعراج ویلایەتێکی تەواو مەزنە لەناو پێغەمبەرێتییەکی سەلمێنراودا و، بە وێنەی کەرامەتێك مەلائیکەتان بە ڕاستی بینییان..

لەم میعراجەدا پێغەمبەر ﷺ سواری بوراق بوو و، وەکو بەرقی لیٚهات و، بە چەشنی مانگی تابان گەشتی ناو گەردوونی کرد و، جیهانی نووریشی بە چاو بینی.

جا هەروەك لەتبوونی مانگ سەبارەت بە مرۆڤ موعجیزەیەکی هەست پێ کراوی مەزن بوو لە جیهانی بینراودا.. میعراجیش مەزنترین موعجیزە بوو پیشانی سەرنشینانی جیهانی گیان درا.

* * *

## بەڵگەی شایەتمان لەناو خۆیدایە

هەریەکە لە دوو وشەی شایەتمان بەڵگە و شایەتیی یەکترین، چونکە یەکەمیان بەڵگەی "لیممی"یە بۆ دووهەم و، دووهەمیشیان بەڵگەی "ئیننی"یە بۆ یەکەم[1]!

* * *

## "ژیان" جۆرێکە لە درەوشانەوەی "وەحدەت"

"ژیان" نووری تاکی(الوحدة)ی خوای گەورەیە..

ئەوەتا "تەوحید" لەناو ئەم هەموو بەدیهاتووە زۆرانەدا بەهۆی ژیانەوە دەردەکەوێت!

بەڵێ، تەنها یەك درەوشانەوەی "وەحدەت" بوونەوەرانێکی گەلێ زۆر و زەبەندە دەکات بە یەك دانە وجوود، چونکە "ژیان" کارێك دەکات کە تەنها یەك

(١) دانەر لە "ئامارەکانی ئیعجاز" ل ٤٤٨دا دەفەرموێ: (بەڵگە، یان "لیممی"یە کە بریتییە لە: بەڵگەهێنانەوە بە کاریگەر(المؤثر) لەسەر کارتێکراو.. یان "ئیننی"یە، کە بریتییە لە: بەڵگەهێنانەوە بە ئاسەوار و کارتێکراو لەسەر بوونی کاریگەر، کە ئەمەیان سەلامەترە). (وەرگێڕ هێناویەتی).

دانە شت خاوەنی هەموو شتان بێت، لە کاتێکدا کە سەرجەمی شتان سەبارەت بە شتی بێ گیان و ژیان لە حوکمی "نەبوو"دایە.

* * *

## "گیان" یاسایەکە بوونی دەرەکیی لەبەرکراوە

"گیان" یاسایەکی نوورانیی وەهایە کە بوونی دەرەکیی لەبەر کراوە و هەست و نەستیشی تێدا دانراوە.

جا ئەم "گیان"ەی کە دارای "بوونی دەرەکی"یە و، ئەو "یاسا"یەش کە بە "ژیری" پەیی پێ دەبرێت، برا و هاوڕێی یەکترن. چونکە "گیان" بە چەشنی یاسا سروشتییە بەردەوام و چەسپاوەکان، لە جیهانی "ئەمر" و سیفەتی "ئیرادە"وە هاتووە.

توانستی خواوەندیش بوونێکی هەست پێ کراو بە "گیان" دەبەخشێت و هەست و نەستی تێدا دادەنێت و، شتێکی ناسك و شل و نیان دەکات بە سەدەفی ئەو گەوهەرە..

خۆ ئەگەر توانستی بەدیهێنەر بوونێکی دەرەکیی بکردایەتە بەر ئەو "یاسا"یانەی کە لە جۆرەکان(الأنواع)دا دەستبەکارن، ئەوا هەریەکەیان دەبوو بە "گیان"ێك.. یان ئەگەر "گیان" ئەم بوونە دەرەکییەی لەبەر دابمالێت و هەست و نەست بخاتە لاوە، دەبێت بە "یاسا"یەکی باقی و بەردەوام.

* * *

## "بوون" بە بێ "ژیان"، "نەبوون"ە!

"ڕووناکی" و "ژیان" هەردووکیان دەرخەر و ئاشکراکەری بوونەوەرانن..

گەر ڕووناکیی "ژیان" لە گۆڕێدا نەبێت، ئەوا "بوون" ئامادە و لەسەر پێیە بۆ "نەمان". تەنانەت هەروەك "نەبوو" وایە.

بەڵێ، ئەو شتەی دارای "ژیان" نییە، نامۆیە.. هەتیوە.. با مانگێکی گەشیش بێت.

* * *

## مێرووله بەهۆی "ژیان"ەوە لە زەوی گەورەترە

ئەگەر بە تەرازووی بوونەوەر مێرووله هەڵبسەنگێنیت، ئەوا ئەو گەردوونەی کە بەهۆی نهێنیی "ژیان"ەوە لە مێروولەدا جێی بووەتەوە لە گۆی زەویماندا جێی نابێتەوە..

خۆ ئەگەر ئەم گۆی زەوییەی کە من بە زیندووی دەبینم و هەندێك پێیان وایە مردووە، لەگەڵ مێروولەدا بەراورد بکەین، ئەوا هێشتا نیوەی سەری ئەو گیاندارە خاوەن هەست و شعوورە دەرناچێت[1]!

* * *

## ئایینی "نەصرانی" تەسلیمی "ئیسلام" دەبێت

ئایینی دیان(النصرانية) لە ئەنجامدا خۆی لە بەردەم "کوژانەوە" یان "خاوێنبوونەوە"دا دەبینێتەوە و، چەك فڕێ دەدات و تەسلیمی ئیسلام دەبێت! ئەوەتا چەندین جار لەتوپەت بوو تا گەیشتە ئەوەی بوو بە "پرۆتستانت" کە ئەمەش هێشتا هەر دادی ئەوی نەدا و، جارێکی دیکەش لەت بووەوە و کەوتە ناو گومڕاییەکی موتڵەقەوە. بەڵام هەندێکیان لە "تەوحید" نزیك بوونەوە و پشت بەخوا سەرفرازیی تێدا دەبیننەوە. وا ئێستاش نزیکە - ئەم ئایینە - جارێکی

(١) بەم واتایە "ئیمامی ڕەببانی" لە شیعرێکدا - کە خوا لێخۆشبوو "مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی" لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی - دەفەرموێ:

خوا! پانی و درێژیی عالەمێ، تۆ — لە سینەی مێرووەکدا جێ ئەکەیتۆ
نە مێروو دڵگوشادیی پێ ئەبەخشی — نە دنیا یەك سەری مووی لێ ئەکەیتۆ!

(وەرگێڕ)

دی لەتوپەت ببێتەوە[١]. خۆ گەر بە تەواوی خامۆش نەبێت و نەکوژێتەوە ئەوا پاڵفتە دەبێت و دەبێ بە موڵکی ئیسلام (چونکە خۆی ڕووبەڕووی ڕاستییەکانی ئیسلام دەبینێتەوە کە بناغەکانی ئایینی ڕاستەقینەی نەصرانیی تێدا کۆبوونەتەوە).

ئەمەش نهێنییەکی مەزنە؛ پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە هەواڵدانی نازڵبوونی حەزرەتی عیسا و، حوکمکردنی بە شەریعەتی ئیسلام و، بەوەش کە کەسێك دەبێت لە نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ، ئاماژەی بۆ کردووە.

* * *

## ڕوانینی تەقلیدی "مەحاڵ" بە "مومکین" دەبینێت

ڕووداوێك ناوبانگی دەرکردووە کە گوایا: لەو دەمەدا خەڵکی چاویان بۆ مانگی یەك شەوەی جەژن دەگێڕا و کەسیان نەیانبینی، پیرێکی بەساڵاچوو سوێندی بۆ خواردن کە بە چاوی خۆی دیویەتی! پاشان دەرکەوت ئەو شتەی کە ئەو بە مانگی یەك شەوەی زانیوە، مانگ نەبووە، بەڵکو تاڵەموویەکی کەوانەیی سپی بووە کە لە برژانگیەوە بەسەر چاویدا لار بووەتەوە[٢]!

جا ئەم تاڵە مووە لە کوێ و مانگی یەك شەوەش لە کوێ؟

ئایا لەم هێمایە تێگەیشتوویت؟!

لە ڕاستیدا "بزووتنی گەردیلەکان" بوون بە چەند تاڵە موویەکی تاریك بۆ برژانگی ژیری، بە چەشنێك کە بەردەمی چاوی ماددییان داپۆشیوە و نابینایان

(١) ئاماژەیە بۆ ئەنجامە سامناکەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی، تەنانەت هەواڵی جەنگی جیهانیی دووهەمیش ڕادەگەیەنێت. (دانەر)

(٢) ئەو پیرە بەتەمەنە هاوەڵی بەڕێز "ئەنەسی کوڕی مالیك" بووە و، ئەو کەسەش تاڵەمووە سپییەکەی لەسەر برۆی ئەو بینیوە و لایبردووە قازیی ئەو کاتەی بەسرە "ئیاسی کوڕی موعاوییەی موزەنی" بووە. بڕوانە: (صور من حياة التابعين)ی عبدالرحمن رأفت الباشا: ٧٨/١، دار الأدب الإسلامي، القاهرة، ٢٠٠٧م. (وەرگێڕ)

کردووە. تەنـانەت ئەو چـاوە مـاددییە وای لـێ هـاتووە کە بـکەری پێکهێنـانی سەرجەمی جۆرەکان نابینێت و، لەم ڕێیەوە کەوتووەتە ناوەندی گومڕاییەوە..

جا ئایا "بزووتنی گەردیلەکان" لە کوێ و.. ڕێکخەری گەردوون لە کوێ؟..

لە وەهمـێکی گەلـێ مەحاڵـدایە ئەو کەسـەی کە پێـی وایە دروسـتبوونی جۆرەکانی بوونەوەران، لە بزووتنی گەردیلەکانەوە پەیدا بوون و هاتوونەتەدی!

* * *

## قورئان پێویستی بە "ئاوێنە" هەیە نەك بە "وەکیل"!

تەنها قودسییەتی سەرچاوەی شەرعە - واتە قورئـانە - کە هـانی جەمـاوەری خەڵك و نەتەوەی ئیسلام دەدات گوێڕایەڵی فەرمانەکانی شـەرع بـن و، پـتر لە هێزی بەڵگە، بۆ ملکەچی دەیانداتەبەر.

لە سەدا نەوەدی ئەحکـامی شـەرع سـەلماون و لەو پێداویسـتییە ئایینییـانە دەژمێررێن کـە پێیان دەوترێت: (ما عُلِمَ مِنَ الـدِّینِ بالضــرورة) و، وەك چەنـد ستوونێکی ئەڵماس وان..

بەڵام بابەتە ئیجتیهـادییە لاوەکی و خیلافییەکـان لە سـەدا دە تێپەڕ نـاکەن. کەواتە نـابێ نەوەد سـتوونی ئەڵـماس لە ژێـر پارێزگـاری و شـوێنکەوتەی دە ستوونی زێڕدا بێت.

کـانزا و گەنجیـنەی سـتوونە ئەڵماسـەکان قورئـان و سـوننەتی خـاوێنن و موڵکی ئەوانن و، تەنها لەو دوو سەرچاوەیە وەردەگیرێن..

بەڵام کتێبەکـانی تـر و ئیجتیهادەکـان دەبـێ تەنهـا ئـاوێنەی دەرخەر و چاویلکەی پیشاندەری ڕووناکیی قورئان بن. چونکە ئەو خۆرە تیشـکبەخش و خاوەن ئیعجازە بە بوونی سێبەر و وەکیل ڕازی نابێت!

* * *

## ئەو مرۆڤەی کە لەسەر ناحەقە، بە گومانی خۆی "ناحەق" بە "حەق" دەزانێت!

مرۆڤ لەبەر ئەوەی خاوەنی سروشتێکی بەڕێزە، هەمیشە حەقی مەبەستە و بەدوایدا عەودالە. جا هەندێ جار لە دەمی گەڕانی بە شوێن حەقدا ناحەقێك دەدۆزێتەوە و پێی وا دەبێ کە حەق بێت! بۆیە پارێزگاریی لێ دەکات.. هەندێ جاری تر لەو کاتەدا کە سەرگەرمی دۆزینەوەی حەقیقەتە - بێ ویستی خۆی - گرفتاری گومڕایی دەبێت و بە حەقی دەزانێت و دەیسەلمێنێت!

* * *

## ئاوێنەکانی "توانست" زۆرن

ئەو ئاوێنـــانەی کە توانســـتی خـــوای گەورە دەردەخەن گەلـــێ زۆرن، هەریەکەیان پەنجەرەیەکی ڕوون و نیـانتر - لەچـاو ئەوانی تـردا - دەکـاتەوە، کە بەسەر یەکێ لە جیهانەکانی "میسال"دا دەڕوانێت..

هەر لە ئـاوەوە تـاکو هەوا و، لە هەواوە تـاکو "ئەثیـر" و، لە "ئەثیـر"ەوە تـا دەگـاتە جیهـانی میســال و، لە جیهـانی میسالیشـەوە تـا دەگـاتە جیهـانی "ڕۆحەکـان" و، لە جیهـانی ڕۆحیشـــەوە تـاکو "کـات" و، لە کاتیشـــەوە تـا "ئەندێشە" و، لە ئەندێشەوە تا دەگاتە بیر(الفکر).. هەموویان چەند ئـاوێنەیەکی جۆراوجـــۆرن کە کاروبـــارە ڕەوان و بە خوڕەمەکـــانی خواوەنـــدیان تێـــدا دەردەکەوێت.. فەرموو گوێ ڕابگرە و سەرنج لە ئاوێنەی "هەوا" بدە، دەبینیت تەنها یەك دانە "وشە"ی تێدا دەبێت بە ملیۆنەها وشەی هاووێنەی یەك!

بەم جـۆرە، "توانسـتی خواوەنـد" نهێنیـی ئەم لەیەکترکەوتـنەوە و لەبەریەك گرتنەوەیە لە سەر ڕووی ئەو جیهانانەدا دەنووسێت و لەبەریان دەگرێتەوە.

* * *

## بەشەکانی "خۆنواندن" جۆراوجۆرن

خۆنواندنی شتان لەناو ئاوێنەدا بە چوار شێوە دەبێت:

یان تەنها وێنەی خـودی ئەو شـتە دەنوێنێـت.. یـان لەگەڵ ئەو وێنەیەشـدا تایبەتکـارییەکەشی دەردەخـات.. یـان خـودی ئەو شـتە و ڕوونـاکیی ماهییەتەکەشی لەگەڵدا دەخاتە ڕوو.. یان هەر تەنها ماهییەتی خودی ئەو شتە دەردەخات.

ئەگەر نموونەشت لەسەر ئەمە دەوێت، ئەوا فەرموو: مـرۆڤ و.. خـۆر و.. مەلائیکەت و.. وشە، بکە بە نموونە..

شتانی چڕ و پڕ لەناو ئاوێنەدا بە وێنەی مردووی بزۆك خۆیان دەنوێنن.

بەڵام خۆنواندنەکانی "گیان"ێکی نـوورانی لەنـاو ئاوێنەکـانی خۆیـدا هەر هەموویان زیندوون و، پەیوەسـتی یەکـترین و، ڕوونـاکییەکی پەخشـانن.. گەر ئەو نوورەی کە لەو ئاوێنەیەدا دەردەکەوێت خودی خۆی نەبێت دیـارە غەیـری خۆیشی نییە!

ئەگەر "خـۆر" خـاوەن ژیـان بـوایە، گەرمیـیەکەی دەبـوو بە ژیـانەکەی و ڕووناکییەکەشی دەبوو بە هەست و نەستی، چـونکە ئەو وێـنەیەی خـۆر کە لە ئاوێنەدا دەردەکەوێت، خاوەنی ئەم تایبەتکارییانەیە.

ئەمەش کلیلی ئەم نهێنییانەیە:

حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسەر بێت - کە لە "سِدْرَةُ الْمُنْتَهـى"دایە، هەر لەو کاتانەدا لە کۆڕی پێغەمـبەر ﷺ لە شـێوەی "دحيـة الكلبـي"دا و لە گەلـێ شوێنی تریشدا، خۆی دەردەخات..

حەزرەتی عیـزرائیلیش - دروودی لەسـەر بێـت - لە یەك شـوێنی دیـار و چەندەها جێگای نادیاری زۆری تردا، کە هەر خوای گەورە دەیانزانێت، ئامـادە دەبێت و گیانەکان دەکێشێت..

پێغەمبەریش ﷺ لە یەك كاتدا و لە كەشفی ئەولیاكان و خەونە ڕاستەكاندا، بـــۆ ئـــوممەتەكەی دەردەكەوێـــت و.. هەروەهـــا لە ڕۆژی حەشری مەزن و قیامەتیشدا، بە شەفاعەتەكەی، سەرجەمی نەتەوەكەی دەبینێت و، ئەوانـیش لەو ڕێیەوە بە دیداری شاد دەبن..

چینی "ئەبدال"ی ئەولیاكانیش - بە هەمان جۆر - لە یەك كاتـدا لە چەنـدین شوێنی جیاجیادا دەردەكەون.

* * *

## دەگونجێ مرۆڤی لێهاتوو ببێت بە "موجتەهید" بەڵام هەرگیز نابێت بە "موشەڕڕیع"!

هەر كەسێك توانای ئیجتیهادی هەیە و مەرجەكانی تێدا كۆبوونەتەوە، بۆی هەیە لەو بابەتانەی كە "دەق"یان تێدا نییە ئیجتیهاد بكات، بـێ ئەوەی بیەوێـت كەسانی تر ناچاری گوێڕایەڵیی ئیجتیهادەكەی ببن. چونكە ناتوانێت بـۆ خـۆی یاسا و شەرع دابڕێژێـت و نەتەوەی ئیسـلام بـۆ لای چەمـك و بۆچوونەكـانی خـۆی بانـگ بكـات. لەبەر ئەوەی تێگەیشـتن و بۆچوونەكـانی ئەو لە ڕیـزی "فیقهی شەرع"دا دادەنرێن و، هەرگیز بە خودی "شەرع" تەماشـا نـاكرێن! هەر لەبەر ئەوەیە كە دەتوانێـــت ببێـــت بە موجتەهیـــد، بەڵام ناتوانێـــت ببێـــت بە شەرعدانەر!

بانگكردنی خەڵكی بۆ لای هەر "بیـر"ێـك بەنـدە بە قبووڵبـوونیەوە لە لای جـــەماوەری زانـــایان. دەنـا بە بیدعـــەت دەژمێررێـــت و دەســـتی بە ڕووەوە دەنرێت و، هەر لە خاوەنەكەیدا دەمێنێتەوە و تێپەڕ ناكـات. چـونكە هەر تەنهـا ئیجماع و جەماوەری زانایانی فیقهـی شـەریعەت دەتـوانن مـۆری شـەریعەتی لەسەر بناسنەوە!

* * *

## تیشکی ڕووناکیی "ژیری" لە "دڵ"ەوە ئاراستە دەکرێت

ئەو بیریارانەی کە تاریکی دایپۆشیون، پێویستە لەم گوفتارەی خوارەوە تێبگەن:

بە بێ ڕۆشنایی "دڵ" هەرگیز "بیر" ڕووناك نابێتەوە..

ئەگەر ئەو ڕۆشناییە لەگەڵ ئەم ڕووناکییەدا ئاوێتەی یەکتری نەبن، ئەوا "بیر" دەبێت بە تاریکاییەکی ئەوتۆ کە ستەم و نەزانیی لێ پەیدا دەبێت..

کەواتە ئەو "بیر"ە لە ڕاستیدا تاریکستانێکە، بە ساختە و نارەوا پۆشاکی "ڕووناکبیری"ی پۆشیوە!

سەرنجی چاوەکانت بدە، ئەوەتا ڕۆژگارێکی سپییان تێدایە، بەڵام سپاییەکی تاریکە.. لە هەمان کاتدا ڕەشاییەکیشیان تێدایە، بەڵام ڕووناکی بەخشە!

خۆ ئەگەر ئەو ڕەشاییە ڕووناکی بەخشەی تێدا نەبێت، هەرگیز ئەو پارچە گۆشتە بە "چاو" دانانرێت و توانای بینینی نابێت.

بە هەمان جۆر "بەصەر"ی بێ "بەصیرەت"یش نرخ و بەهای نییە!

جا هەر "بیر"ێکی سپی و خاوێن ئەگەر "کرۆکی دڵ"(سویداء القلب)ی ئاوێتە نەبێت، ئەوا هەرگیز دەرەنجامی دەستکەوتەکانی مێشك بە "زانست" و "بەصیرەت" دانانرێت!

کەواتە بە بێ "دڵ"، "عەقڵ"یش لە ئارادا نییە!

* * *

## پلەکانی "زانست" لە مێشکدا جیاجیا و ئاڵۆزن

مێشك چەند پلەیەکی تێدایە کە هەرچەند حوکمی هەریەکەیان لەوانی تر جیایە، کەچی لە یەك دەچن و لە بەرچاوی مرۆڤدا دەئاڵۆزێن..

لە پێشدا "خەیاڵکردن" دروست دەبێت، ئنجا "تەسەوور" پاشان "پەسەندکردنی ژیری"و، پاش ئەویش "سەلماندن" و، ئنجا "ملکەچی" و، پاشان "کارپێکردن"، دوای ئەویش "باوەڕ پێ بوون"..

کەواتە باوەڕبوونت بە هەر شتێك جیایە لە کارکردنت پێی.

هەریەك لەم پلانەش حاڵەتێکی لێوە پەیدا دەبێت:

توندی(الصلابة) لە باوەڕبوونەوە پەیدا دەبێت و، دەمارگیری لە کارپێکردن و، گوێڕایەڵی لە ملکەچبوون و، کارپێکردنیش لە سەلماندنەوە پەیدا دەبن و، بێلایەنییش لە "ژیری"دا دەبێت و، دەستبەرداری(التجرد)یش لە تەسەوورەوە سەرهەڵدەدات و، سەفسەتەش لە خەیاڵەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر توانای ئاوێتەکردنی تەواوی نەبێت.

جا وێنەکێشانی کاروبارە ناڕەواکان بە ڕێکوپێکی و باسکردنیان بە جوانی، دەبێت بەهۆی زامداربوون و گومڕاکردنی زەینە خاوێنەکان.

* * *

## زانستێك کە تێگەیشتنی مەیسەر نەبێت
## نابێ بوترێتەوە

زانای ڕابەر و ڕاستەقینە لە پێناوی خوای گەورەدا زانستەکەی بە خەڵکی دەبەخشێت، بێ ئەوەی چاوەڕوانیی هیچ پاداشتێکیان لێ بکات و، وەکو مەڕ دەبێت نەك مەل. ئەوەتا مەڕ شیرێکی خاوێن و پوخت دەرخواردی بەرخۆلەکانی دەدات، بەڵام باڵندە ڕشانەوەی پڕلیکی ناو دەمی خۆی بە دەم بێچووەکانیەوە دەکات!

* * *

**"کاولکاری" لە "بنیاتنان" ئاسانترە و، مرۆڤی لاوازیش دەبێت بە کاولکار!**

"بــوون"ی هەر شــتێك بەنــدە بە بــوونی هەمــوو بەشــەکانیەوە، کەچــی "نەبوون"ی یەکێك لە بەشەکانی دەبێت بەهۆی نەبوونی ســەرجەمی ئەو شــتە! هەر لەبەر ئەمەیشە کە ڕووخاندن گەلێ ئاسانترە لەچاو بنیاتناندا..

ئا لێرەوەیە کە مرۆڤی لاواز مەیلی بە لای کاولکــاری و ئەنجامــدانی کــاری سەلبییەوەیە، تەنانەت هەر ناشچێت بەلای کاری ئیجابیدا!

* * *

**"هێز" دەبێ خزمەتی "حەق" بکات**

ئەگەر:

دەستوورەکانی حیکمەت و..

یاساکانی حکومەت و..

قانوونەکانی حەق و..

ڕێساکانی هێز، ئاوێتەی یەکتر نەکرێن و پشتی یەکتری نەگرن و هاوکارییان لە نێواندا نەبێت، ئەوا لای جەماوەری خەڵك هیچ کامیان بەرهەمدار و خاوەن کاریگەری نابن و، لە ئەنجامدا شەعائیری شەرع پشتگوێ دەخرێن و، خەڵکی لە کاروبارياندا پشتیان پێ نابەستن و باوەڕیان پێیان نامێنێت!

* * *

**هەندێ جار "شت" دژەکەی تێدا دەبێت**

زەمانێــك دێــت کە دوو شــتی دژ بە یەك یەکــتری دەپۆشــن و، لە زمــانی سیاســەتدا وشــە دژی واتــا دەبێــت و، ســتەم[1] کــڵاوی "دادگەری" لەســەر

(١) بە جۆرێك لەم ڕووداوە دەدوێت دەڵێی لەم زەمانەدا ژیاوە! (دانەر)

دەکات و، خیانەتیش بە نرخێکی هەرزان پۆشاکی "غیرەت" دەپۆشێت و، جیهادێکیش کە لە پێناوی خوادا بێت، ناوی "بەغی"ی لێ دەنرێت و، دیلی و بەندیی ئاژەڵانە و ستەمکاری و ملهوڕیی شەیتان ئاسایش، بە "سەربەستی" ناو دەبرێت!

بەم جۆرە، دژەکان وەکو یەکتر دەنوێنن و شێوە و ڕوخسارەکان جێگۆڕکێ دەکەن و ناوەکانیشیان بەرامبەر یەکتری ڕادەوەستن و مەقامەکانیش لەگەڵ یەکتریدا جێگا دەگۆڕنەوە.

* * *

## "سیاسەت"ی پابەندی "بەرژەوەندی" دڕندەیەکی سامناکە!

سیاسەتی ئەم ڕۆژگارە کە لە خولگەی "بەرژەوەندی"دا دەخولێتەوە، ئاژەڵێکی دڕندەی سامناکە!

خۆ ئاشکرایە کە خۆبردنە پێشەوە و خۆ خۆشەویستکردن لە بەردەم دڕندەیەکی برسیدا هەرگیز بەزەیی ئەوت بۆ ناجووڵێنێت، بەڵکو ئیشتیهای دەبزوێنێت، پاشان لە سەرووی ئەمەیشەوە داوای حەقدەستی کەڵبە و نینۆکەکانیت لێ دەکات!

* * *

## لەبەر ئەوەی مرۆڤ هێزەکانی لە سنوورێکدا دەستنیشان نەکراون، ئەوا تاوانەکانی هەمیشە لە گەورەبووندان!

ئەو هێزانەی لە مرۆڤدا دانراون، بە سروشت لە سنوورێکدا دەستنیشان نەکراون تا لێیان لانەدات، بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە، بۆیە ئەو خێر و شەڕەی لە مرۆڤەوە دەوەشێتەوە، هێندە زۆرن کۆتاییان پێ نایەت! خۆ ئەگەر لە مرۆڤێکدا لەخۆباییبوون و لە یەکێکی تردا سەرسەختی و ملنەدان یەکبگرن، ئەوا تاوانێکی

گەورەی وا بەرهەم دەهێنن[1] کە هێشتا لەناو فەرهەنگی مرۆڤدا ناوی لێ نەنراوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی دۆزەخ. چونکە مەگەر دۆزەخ دەنا هیچ ئازارێکی تر بە سزای ئەو تاوانە دانانرێت!

یان بۆ نموونە: هی وا هەیە پڕ بەدڵ ئاوات دەخوازێت کە موسیبەت و گیروگرفت تووشی موسڵمانان ببێت، هەر تەنها لەبەر ئەوەی ڕاستیی قسە و بۆچوونەکەی خۆی دەربکەوێت و لای خەڵکی بسەلمێنرێت!

ئەم ڕۆژگارە دەری خست کە:

بەهەشت گرانە؛ هەرزان نییە.. دۆزەخیش زیاد لە پێویست دروست نەکراوە!

* * *

## هەندێ جار "خێر"ێك دەبێت بەهۆی "شەڕ"ێك

ئەو تایبەتمەندییەی کە مرۆڤانی "خەواص" هەیانە، لە ڕاستیدا، هۆیەکە بۆ تەوازووع و خۆنەویستی.. بەڵام بەداخەوە بووە بەهۆی خۆ بەگەورە گرتن و خۆسەپاندن بەسەر کەسانی تردا!

هەروەها دەستەوسانی و هەژاریی "عەوام"یش لە ڕاستیدا داخوازی بەزەیی پێدا هاتنەوە و خەم بۆخواردنە.. کەچی بەداخەوە لەم سەردەمەدا بوون بەهۆی ئەوەی کە بەرەو دیلی و ڕسوایی بیانداتەبەر!

خۆ ئەگەر چاکە و شەرەفمەندییەك لە هەر شتێکدا ببێت، دەدرێتە پاڵ چینی تایبەتمەند و سەرکردە و گەورەکان.. بەڵام گەر خراپە و کارێکی ناپەسەند پەیدا ببێت، بەسەر خەڵکی و عەوامدا دابەش دەکرێت!

ئەوەتا لە بەرامبەر ئەو شەرەفمەندییەی کە هۆزێکی سەرکەوتوو لە کێشەیەکدا بەدەستی هێناوە، دەوترێت: (دەستخۆش ئەی سەرگەورەی هۆز)!

---

(١) ئەمە ئاماژەی تێدایە بۆ ئەو ڕووداوانەی کە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن. (دانەر)

بەڵام گەر ئەنجامی ئەو كێشەیە پێچەوانە بوایە، دەوترا: (دەك ڕسواتربن كوڕانی ئەو هۆزە)!

ئەمەیە "شەڕ"ی ئازاربەخش لەناو گرۆی مرۆڤدا!

* * *

## ئەگەر "كۆمەڵ" بێ ئامانج بێت، "خۆپەرستی"ی تێدا بەهێز دەبێت!

ئەگەر "بیر"ی كۆمەڵ، خاوەن ئامانجێكی میسالی نەبێت.. یان ئەو ئامانجە لە بیر چوو بێتەوە.. یان لە بیری خۆ برابێتەوە، ئەوا زەینەكان دەگۆڕێن و دەبن بە "خۆپەرستی" لەم و لەودا و، لە دەوری ئەو خۆپەرستییانە خول دەخۆن..

واتە وردە وردە "من"ی هەموو یەكێكی ئەو كۆمەڵە بەهێز دەبێت و، لەوانەشە وەك ئاسن ڕەق ببێت تا وای لێ دێت نەتوانرێت كوناوەدر بكرێت و بگۆڕرێت بە "ئێمە"!

جا ئەو كەسانەی كە "من"ی خۆیان خۆش دەوێت، هەرگیز خۆشەویستیی ڕاستەقینەیان بۆ هیچ كەسێك نابێت!

* * *

## هۆكاری بووژانەوەی شڵەژان و ئاشووب:
## مردنی "زەكات" و ژیانەوەی "ڕیبا"یە

بناغە و كانگای هەموو جۆرەكانی پشێوی و ئاڵۆزی و ناكۆكی و، هۆكار و سەرچاوەی بزوێنەری گشت جۆرەكانی خراپە و ڕەوشتە نزمەكان، تەنها دوو وشەن یان دوو ڕستەن:

**وشەی یەكەم:** (گەر من بۆخۆم تێربم چیم لە خەڵكی داوە، با لە برساندا بمرن)..

**وشـەی دووهەم:** (تـۆ لە پێنـاوی حەوانەوەی منـدا گیروگرفتەکـانی ژیـان هەڵبگرە.. تۆ کار بکە با مـن بەری ڕەنجـت بخـۆم.. ئەرکی کـار لەسـەر تـۆ و خواردنیش لەسەر من)!

ئەو دەرمانە شیفابەخشەی کە دەماری ژەهرە کوشـندەکەی وشـەی یەکەم لە بنج و بێخدا دەردەهێنێت، بریتییە لە "زەکاتـدان" کە یەکـێکە لە پێـنج پایەکـانی ئیسلام.

ئەو چارەسەرەش کە دەماری درەختـی زەقـوومی نـاو وشـەی دووهەمـیش ڕیشەکەن دەکات، بریتییە لە "حەرامکردنی سوو".

جا ئەگەر گـرۆی مـرۆڤ حەز بە چـاکە و ژیـانی بەرز و مەردانە دەکـات، دەبێ "زەکات" فەرز بکات و "ڕیبا"ش بە تەواوی لە ناودا لا ببات.

* * *

## گرۆی مرۆڤ گەر بەتەمای ژیانە، با هەموو جۆرەکانی سوو(الرِّبا) لەناو ببات

سیلەی ڕەحمی نێوان هەردوو چینی عەوام و خەواص پچـڕاوە و، زایەڵەی پشێوی و هاواری تۆڵەسەندنەوە و، ڕقی قین و حەسوودی لە چینـی عەوامەوە بەرز بووەتەوە و، ئاگری ستەم و سووکایەتی و ڕەزاگرانیی خـۆبەگەورەزانـین و هۆکارەکانی خۆ بەسەردا سەپاندنیش لە لای چینی خەواصەوە بەسەر عەوامـدا داباریوە..

لە کاتێکدا کە دەبـوو چینـی عەوام: گـوێڕایەڵی و، خۆشویسـتن و، ڕێـز و ملکەچییـان بەرامـبەر چینـی خەواص تێـدا بـووایە، بە مەرجـێ لە چینـی خەواصەوە چاکە و بەزەیی و میهرەبانی و پەروەردەیان ئاراستە بکرایە.

جـا ئەگەر مرۆڤـایەتی دەیەوێـت ژیـانی بەردەوام بێـت، دەبـێ دەسـت بە "زەکات"ەوە بگرێت و "ڕیبا"ش لە خۆی دوور بخاتەوە!

چونکە دادگەریی قورئان لە دەرگای جیهاندا ڕاوەستاوە و بە ڕیبا دەڵێت: (قەدەغەیە.. مافی هاتنە ژوورەوەت نییە.. بگەڕێرە دواوە).

بەڵام گرۆی مرۆڤ گوێی بۆ ئەم فەرمانەی قورئان ڕانەگرت، تا لە ئەنجامدا زللەیەکی سەختی خوارد[1]. چار نییە دەبێ پێش ئەوەی زللەیەکی توند و تاڵتر بچێژێت، گوێڕایەڵیی ئەم فەرمانەی قورئان بکات.

* * *

## مرۆڤ کۆت و زنجیری دیلیی تێکشکاند، ڕۆژێکیش دێت که زنجیری کرێگرتەییش دەپچڕێنێت!

لە خەونێکدا وتم:

جەنگە سووکەڵەکانی نێوان دەوڵەتان و گەلان جێی خۆیان چۆڵ دەکەن بۆ ململانێ و جەنگێکی گەلێ دژوارتر لەنێوان چینەکانی مرۆڤدا. چونکە مرۆڤ لە قۆناغەکانی مێژووی خۆیدا بە "دیلێتی" ڕازی نەبوو، بەڵکو بە خوێنی خۆی کۆت و زنجیرەکانی ئەو دیلییەی شکاند و لە ئەستۆی خۆی داماڵی. بەڵام ئێستا لە بریی ئەو دیلییە گرفتاری ئەرکی سەختی "کرێگرتەیی" بووە و، ڕۆژێك دێتە پێش کۆتی ئەو بەندییەش تێکدەشکێنێت!

سەری مرۆڤ بە جارێ سپی بووە، پاش ئەوەی کە بە پێنج قۆناغدا تێپەڕی کرد:

جەنگەڵی، دەشتەکێتی، کۆیلایەتی، دیلی، دەرەبەگایەتی، وا ئێستاش لە قۆناغی کرێکاریدایە. مرۆڤ بەم جۆرە هاتووە و دەڕوات.

* * *

---

(١) ئاماژەیەکی بەهێزە بۆ داهاتوو، ئەوەبوو مرۆڤایەتی گوێی بۆ ئەم بانگەوازەی قورئان ڕانەگرت، تا زللەیەکی سەختی لەسەر دەستی جەنگی جیهانیی دووهەم چەشت. (دانەر)

## ڕێگای ناڕەوا مرۆڤ دەگەیەنێتە پێچەوانەی ئامانجەکەی

فەرموودەی: "القاتِلُ لا یَرِثُ"[١] دەستوورێکی مەزنە..

ئەو کەسەی بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی ڕێیەکی نامەشروَع دەگرێتەبەر، زۆربەی جار بە پێچەوانەی نیازەکەی سزا دەدرێت. بۆ نموونە:

خۆشویستنی نامەشرووعی ئەوروپا و چاولێکردن و هۆگربوونی، سزاکەی دوژمنایەتییەکی غەددارانەیە لە لایەن ئەو خۆشەویستەوە و، ئەنجامدانی تاوانە مەزنەکانە!

بەڵێ، مرۆڤی فاسق؛ مەحرووم و بێ بەشە و، هەرگیز چێژ و لەزەت و ڕزگاریی دەستگیر نابێت.

* * *

## "جەبرییە" و "موعتەزیلە" هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەك حەقیقەتیان تێدایە

ئەی عەودالّی حەقیقەت!

ئەو ڕوانینەی کە شەریعەت سەیری "ڕابوردوو" و "موسیبەت"ی پێ دەکات جیایە لەوەی کە سەیری "داهاتوو" و "گوناهباری"ی پێ دەکات..

ئەوەتا بە چاوی (قەدەری خوای گەورە) بۆ "ڕابوردوو" و "موسیبەتەکان" دەڕوانێت.. قسەی بەجێ لێرەدا هی "جەبرییە"یە!

بەڵام بە چاوی (تەکلیفی خوای گەورە) بۆ "داهاتوو" و "گوناهەکان" دەڕوانێت.. قسەی ڕەوا لێرەدا هی "موعتەزیلە"یە!

بەم جۆرە "موعتەزیلە" و "جەبرییە" لەم حاڵەدا لەگەڵ ڕێڕەوی حەق یەك دەگرنەوە.

---

(١) رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه والدارمي وأحمد في مُسنده. واتە: مرۆڤی قاتڵ میرات لە کوژراوەکەی نابات. (وەرگێڕ)

جــا هەریەك لەم ڕێچــکە نارەوایــانە بە ئەنــدازەی دەنــکە دانەوێــڵەیەك حەقیقەتیان تێدایە و، ئەم حەقیقەتەش شـوێنی تـایبەتیی خـۆی هەیە. نـاحەقی لەوەدایە کە وا بزانرێت سەرجەم بۆچوونەکانی تـری ئەو ڕێچـکەیە ئـاوا دارای حەقیقەت بن!

* * *

## "دەستەوسانی" و "ترس" پیشەی مرۆڤی لاوازە

ئەگەر ژیانت دەوێـت، ئەوا لەو کێشە وگرفتانەی کە دەکرێـت چارەسـەریان بۆ بدۆزیتەوە، دەستەوسان مەبە..

ئەگەر حەوانەوەشــت دەوێــت، ئەوا لەو کێشــانەدا کە چارەســەر نــاکرێن مەشڵەژێ و خەفەتبار مەبە.

* * *

## هەندێ جار شتی بچووك، شتانی گەورەی لێ دەبێتەوە

چەند بارودۆخێکی ئەوتۆ دێنەکایەوە کە تەنها یەك جووڵەی بچووك مـرۆڤ بۆ پلەی هەرە بەرزی "أعلى عليين" بەرز دەکاتەوە..

بە هەمان جۆر بارودۆخی وەهاش ڕوو دەدات کە کارێکی سادە و ئاسـایی خاوەنەکەی بەرەو نزمترین نزمی (أسفل سافلين) بەردەداتەوە!

* * *

## "یەك چرکە" بۆ هەندێ کەس وەك "ساڵێك" وایە

سروشتی ئادەمیزاد دوو جـۆرە: هەنـدێکیان یەکسـەری تیشـك دەداتەوە و، هەندێکی تریشیان پلە پلە و کەم کەم بڵند دەبێت و دەدرەوشێتەوە.

سروشــتی مــرۆڤ وەك ئەم دوو حــاڵە وایە و، بەپێــی هەلــومەرج و بارودۆخەکان دەگۆڕێت..

هەندێ جار هەنگاو بە هەنگاو دەڕوات و، هەندێ جاری تریش وەك باررووتی ڕەش یەکسەری دەتەقێتەوە و ئاگرێکی ڕووناکی بەخشی لێ دەبێتەوە.

ڕوانینی وا هەیە خەڵووز دەگۆڕێ بە ئەڵماس و..

دەستلێدانی وەهاش هەیە بەرد دەکات بە ئیکسیر.

ئەوەتا ڕوانینی پێغەمبەر ﷺ بە کتوپڕی و یەکسەری دەشتەکیی نەزان دەگۆڕێت بە خواناسێکی ڕووناك.

گەر تەرازووت بۆ ئەمە دەوێت، ئەوا سەرنج لە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب بدە - خوای لێ ڕازی بێت - لە پێش ئیسلام و لە دوای ئیسلام بوونیدا!

نموونەی ئەمەش: "تۆو" و "درەخت"ە، کە یەکسەر بەرەکانی پێدەگەیەنێت و پێشکەشیان دەکات.

جا ئەو ڕوانین و هیممەتەی پێغەمبەر ﷺ سروشتە خەڵووزئاساکانی نیوەدوورگەی عەرەبی گۆڕی بە چەندین ئەڵماسی درەخشان و.. ڕەوشت و ڕەفتارە تاریك و سووتێنەرەکانی چەشنی باررووتی ڕەشیشی گۆڕی بە خووڕەوشتی بەرز و ڕووناك.

* * *

## "درۆ" وشەیەکی کافرە

یەك دەنکە دانەوێڵەی "ڕاست" خەرمانێکی "درۆ" دەدات بەبادا..

یەك "ڕاستی" کۆشك و تەلارێکی ئەندێشە دەڕووخێنێت..

کەواتە ڕاستگۆیی بناغەیەکی مەزن و، گەوهەرێکی درەخشانە.

لەوانەیە، گەر زیان لە وتنیدا ببێت، جێگاکەی خۆی بۆ "بێدەنگی" چۆڵ بکات. بەڵام هەرگیز جێی "درۆ" لەو نێوانەدا نابێتەوە، هەرچەندەش سوود و "بەرژەوەندیی" زۆری تێدا بێت!

دەبا هەموو گوفتارەکانت ڕاست بن و گشت بڕیارەکانیشت حەق بن..
بەڵام دەبێ بزانیت کە مافی ئەوەت نییە هەموو "ڕاست"ێك بدرکێنیت!
ئەم قاعیدەیە بکە بە دەستووری ژیانت:
"خُذْ ما صَفَا، دَعْ ما كَدَر".
کەواتە بە باشی سەیر بکە و بە جوانی ببینە، با بیرت جوان بێت. هەروەها گومانی باش ببە و جوان بیر بکەرەوە، با ژیانی پڕ لە تام و چێژی بەختەوەریت دەستگیر ببێت.
ئەو ئاوات و هیوایەی لە "گومانباشی"دایە گیان دەکات بە بەری ژیاندا!
بەڵام نائومێدیی ناو دووتوێی "گومانخراپی" بەختەوەریی مرۆڤ گەندەڵ دەکات و ژیانی لەناو دەبات!

* * *

## ئەنجومەنێك لە "جیهانی میسال"دا

(بەراوردێکە لە نێوان شارستانێتیی نوێ و شەریعەتی خاوێندا و..
"زیرەکی"ی زانستی و "ڕێنمایی" خوای گەورەدا).

لە دەمی هودنەکەی کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی و، لە شەوێکی جومعە و لە خەونێکی ڕاستدا، ڕۆشتمە ناو ئەنجومەنێکی بەسام و شکۆی جیهانی میسالەوە.
لەوێ لێیان پرسیم:
"جیهانی ئیسلام پاش ئەم شکستەی هاتە ڕێی، چیی بەسەر دێت"؟
ئەم پرسیارەیان لێ کردم و گوێیان بۆ وەڵامەکەی ڕاگرت.
منیش بە سیفەتی ئەوەی کە لەو کۆڕەدا نوێنەری ئەم چەرخ و سەردەمەی ئێستا بووم، وتم:

ئەم دەوڵەتەی[1] کە لە دێـر زەمـانەوە پارێزگـاریی سـەربەخۆیی جیهـانی ئیسلامیی خستبووە ئەستۆی خۆی و، لە پێناوی بەرزکردنەوەی وشەی "اللّـه"دا ئەرکی جیهادی - وەك فەرزێکی کیفـایەت لە بریـی سـەرجەمی موسـڵمانان - جێبەجێ دەکرد و، لە پێناوی جیهـانی ئیسـلامیدا - کە وەك یەك جەسـتە وایە - خۆی لە هەڵوێسـتی قوربـانی و خۆبەختکاریـدا دانـابوو و، ئـاڵای خەلافەتی هەڵکردبوو.. ئەم دەوڵەت و نەتەوە موسڵمانە، لە پـاش ئەم گیروگـرفتەی هـاتە ڕێـی، بە پشـتیوانیی خـوای گەورە، بە سەربەسـتی و بەختەوەریـیەکی ئەوتـۆ پاداشت دەدرێتەوە کە سەرانسەری جیهـانی ئیسـلامی بگـرێتەوە و قەرەبـووی گیروگرفت و زیانەکانی پێشوویان بۆ بکاتەوە. چونکە بێگومان ئەو کەسەی کە "سـێ" دەبەخشـێت و "سـێ سـەد" دەبـاتەوە هەرگیـز بە زەرەرمەنـد و دۆڕاو دانانرێت. مرۆڤی خاوەن هیممەتیش ئەو کەسەیە کە باری ئێسـتای دەگۆڕێـت بە ئاینـدەیەکی گەش و خەنـدان. خـۆ ئەم گیروگـرفتەش بە چەشـنێکی سەرسووڕهێن و دەراسا(خارق) شەفەقەت و برایەتی و پەیوەندیی پتەوی نێوان موسڵمانانی زیندوو کردەوە!

گەشەکردن و پەرەسەندنی "برایەتی"ی نێـوان موسـڵمانان، پشـت بە خـوا، شارستانێتیی خۆرئـاوا لە جێـی خۆیـدا دەلەقێنێـت و دارمـان و کۆتـاییەکەشی نزیـك دەخـاتەوە. ئەو کـاتەش ڕوخسـاری شارسـتانێتیی ئێسـتا دەگۆڕێـت و ڕژێـمەکەشی سـەرنگووم دەبێـت، ئیـتر لەو دەمەدا شارسـتانێتیی ئیسـلام بە بەرجەستەیی دەکەوێتە ڕوو و، موسڵمانانیش یەکەم کەس دەبـن کە بە ویسـتی خۆیان پێشوازیی لێ دەکەن و دەڕۆنە ناویەوە.

گەر دەتەوێـت بەراوردێـك لە نێـوان شارسـتانێتیی شـەرع و شارسـتانێتیی ئێستای ئەوروپادا ساز بکەیـت، ئەوا بە وردی سـەیری بناغەکـانی هەریەك لەو

(١) مەبەست دەوڵەتی عوسمانییە. (وەرگێڕ)

دوانە بكە و، پاشان هەر بۆ خۆت لە ئاسەوار و ئەنجامەكانی هەردووكیشیان ورد ببەرەوە:

هەرچی شارستانێتیی خۆرئاوایە لەسەر پێنج بناغەی سەلبی دامەزراوە و لەو خولگەیەدا دەخولێتەوە:

خاڵی پشت پێبەستنی بریتییە لە "هێز" لە بریی "حەق"! دیارە "هێز"یش مافخواردن و سنوورشكاندن و دەستدرێژیی لێ دەبێتەوە، كە ئەمانەش "خیانەت"یان لێ پەیدا دەبێت.

مەبەست و ئامانجیشی، لە بریی "فەزیلەت"، بریتییە لە "بەرژەوەندی"یەكی نزمی بێنرخ. خۆ وەك ئاشكرایە ئەم بەرژەوەندییە پاڵپاڵێن و دوژمنایەتیی لێ دەبێتەوە، كە ئەمانەش "جینایەت"یان لێ دەوەشێتەوە.

دەستووری ژیانیش بەلایەوە بریتییە لە "مشتومڕ و ململانێ"، لە بریی "هاوكاری". خۆ دیارە كە دوژمنایەتی و ململانێ هەردەم قڕە و بڕە و پاشقول لەیەكترگرتنی لێ دەبێتەوە و، لەمانەشەوە "دەنائەت"ی خوو و ڕەوشت پەیدا دەبێت.

ئەو پەیوەندییە بنەڕەتییەش كە بۆ هاوئاهەنگیی نێوان خەڵكی دایدەنێت بریتییە لەو "دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی"یەی كە لەسەر حسابی نەتەوەكانی تر گەشە دەكات و پەرەدەسێنێت و بە هەڵلووشینی خەڵكانی تر بەهێز دەبێت. خۆ وەك ئاشكرا و لە بەرچاودایە، هەریەك لە دەمارگیری و قەومییەتی سەلبی و ڕەگەزپەرستی، هەمیشە ئاژاوە و جەنگی سامناك و سەختیان لێ دەبێتەوە، كە ئەمانەش دەبنە هۆی كاولكاری و تیاچوونی هەرشتێك دەستیان پێی بگات.

پێنجەم بناغەی ئەم شارستانێتییە ئەوەیە كە خزمەتە سەرنج ڕاكێشەكەی بۆ گرۆی ئادەمیزاد بریتییە لە هاندانی حەز و ئارەزووەكان و تێركردنیان و ڕێ خۆشكردن بۆ هێنانەدیی خواستەكانی ئەو ئارەزووانە. خۆ ئاشكرا و لە بەرچاوە كە حەز و ئارەزووەكان هەمیشە سەروسیمای مرۆڤانەی ئادەمیزاد دەشێوێنن و

خوو و ڕەفتارەکانی دەگۆڕن و، لە ئەنجامدا مرۆڤایەتییەکەی - بە تەواوی - ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و بە چەشنێکی مەعنەوی مەسخ دەبێت!

ئەگەر بتوانیت دیوی ناوەوەی زۆربەی ئەو مرۆڤە (شارستانییانە) هەڵبگێڕیتەوە و ناوەرۆکیان بخەیتە ڕوو، ئەوا ڕەفتار و خووی مەیموون و ڕێوی و مار و ورچ و بەراز، لە ڕوخسار و سیمایاندا بەدی دەکەیت! تەنانەت پێست و تووك و فەرووی ئەو ئاژەڵانە بەر ئەندێشەت دەکەون و لە خەیاڵت دەخشێن! ئەوەتا ئاسەوارەکانیان بەڵگەن لەسەریان!

لە سەرانسەری گۆی زەویدا جگە لە تەرازووی "شەریعەت" هیچی تر شك نابرێت.. ئەو شەریعەتە میهرەبانەی کە لە ئاسمانی قورئانی پیرۆزەوە نازڵ بووە و خەڵاتی گرۆی مرۆڤ کراوە.

بەڵام شارستانێتیی قورئانی پیرۆز لەسەر پێنج بناغەی ئیجابی دامەزراوە:

خاڵی پشت پێبەستنی، لە بریی "هێز" بریتییە لە "حەق".. خۆ ئاشکرایە کە "حەق" هەمیشە دادگەری و هاوسەنگی دادەمەزرێنێت و، لەمانەشەوە ئاسایش سەر هەڵدەدات و، بنەوبارگەش بە "چارەڕەشی و بەدبەختی" دەپێچێتەوە و کۆچی پێ دەکات.

ئامانجیشی، لە بریی "بەرژەوەندی" بریتییە لە "فەزیلەت". دیارە بەرهەمی "فەزیلەت"یش خۆشەویستی و تەبایی و لێکنزیکبوونەوەیە و، ئنجا لەمانەشەوە بەختەوەری پەیدا دەبێت و، دوژمنایەتیش دەڕەوێتەوە.

دەستووریشی لە ژیاندا، لە بریی جەنگ و ململانێ، بریتییە لە هاوکاری و هاوئاهەنگی و یارمەتیدانی یەکتری. دیارە ئەم دەستوورەش یەکبوون و پشتگیری لە نێوان مرۆڤدا بەرهەم دەهێنێت، کە لە ڕاستیدا ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ تەنها لەسەر ئەم دوو ستوونە ڕاگیر دەبێت.

خزمەتگوزاریشی بۆ کۆمەڵ بە "هودا" دەبێت نەك بە "هەوا" و ئارەزووەکان. خۆ "هودا"یش ئاستی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە و خۆشگوزەرانیی پێ دەبەخشێت.

جگە لەمانە، ڕووناکی ئاراستەی "گیان"یشی دەکات و سەرجەم پێداویستییەکانی بۆ فەراهەم دەهێنێت.

هۆکارە پەیوەندیدەرەکانی نێوان کۆمەڵانی مرۆڤ بەلایەوە بریتین لە پەیوەندیی "ئایین" و "هاونیشتمانی" و "پەیوەندییەکانی کار و پیشە" و "برایەتیی ئیمانی". وەك ئاشکرایە ئەم چەشنە پەیوەندییانە هەمیشە برایەتیی بێگەردی ڕاستەقینە بەرهەم دەهێنێت و، ڕەگەزپەرستی و قەومیەتی سەلبی لە گۆڕێدا لا دەبات.

تەنها لە ڕێی ئەم شارستانێتییەوە، ئاسایشی گشتی هەموو لایەك دەگرێتەوە، چونکە ئەم شارستانێتییە هەمیشە لە هەڵوێستی بەرگریدایە لە بەرامبەر هەر چەشنە دەستدرێژییەکی دەرەکی.

ئێستا تێدەگەین کە بۆچی جیهانی ئیسلام پشتی لەم شارستانێتییە نوێیە هەڵکرد و وەری نەگرت و، موسڵمانانیش - بە ویستی خۆیان - پێشوازییان لێ نەکرد و تێکەڵی نەبوون؟ چونکە هەروەك هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت، زیانیشیان لێ دەدات، ئەوەتا بە کۆت و زنجیرەکانی دەیانبەستێتەوە. تەنانەت نەك هەر مەڵهەمی شیفا و سارێژکاری بە گرۆی مرۆڤ نەبەخشی، بەڵکو بوو بە ژەهرێکی کوشندە بۆیان و، پتر دەردەکانی کوڵاندنەوە و ئازارەکانیشی زیاتر بۆ هێنانەوە سۆ. چونکە لەسەدا هەشتای گرۆی مرۆڤی دووچاری بەدبەختی و دەردیسەریی ژیان کرد، لە پێناوی ئەوەی کە بەختەوەرییەکی ساختە و ڕووکەش بۆ تەنها لە سەدا دەی ئەوان مسۆگەر بکات! ئنجا دە دانەکەی تریشی لە نێوان ئەو دوو گرۆیەدا بە سەرگەردانی و نەحەساوەیی گرفتار کرد!

لەم چەشنە شارستانێتییەدا، قازانجە بازرگانییەکان لە دەستی کەمایەتییەکی ستەمکاردا کۆ دەبنەوە. لە کاتێکدا کە بەختیاریی ڕاستەقینە لەوەدایە بەختەوەری بە هەمووان ببەخشێت، هیچ نەبێ زۆربەی خەڵکی لە گیروگرفتەکانیان ڕزگار بکات!

قورئانی پیرۆز - کە مایەی بەختەوەریی سەرجەمی خەڵکی و سەرانسەری جیهانە - تەنها یەك جۆر شارستانێتی پەسەند دەکات و وەریدەگرێت، ئەویش ئەو چەشنە شارستانێتییەیە کە بەختەوەری بە "هەموو" گرۆی مرۆڤ یان "زۆربە"یان ببەخشێت..

کەچی شارستانێتیی ئێستا وا ناکات؛ دەچێت پەتی هەوا و ئارەزووەکان دەپچڕێنێت و، سەربەستییەکی ئاژەڵانەیان بۆ دەڕەخسێنێت. تەنانەت هێندە دیکتاتۆرییەت و خۆسەپاندنی شەهوەت و هەوا و ئارەزووەکانی تێدا زاڵ بووە کە شتانی ناپێویستیان بۆ مرۆڤ خستووەتە حوکمی پێویست و ناچارەکی!

بەم جۆرە، ئاسوودەیی و حەوانەوەی بە تەواوی لە بەر گرۆی مرۆڤ داماڵیوە. چونکە لە کاتێکدا کە مرۆڤ، لە قۆناغی ژیانی دەشتەکێتیدا، بۆ گوزەران و ژیانی خۆی پێویستی تەنها بە چوار شتی سەرەکی بوو، ئێستا شارستانێتیی نوێ دووچاری هەژارییەکی لەڕادەبەدەری کردووە و سەد و یەك پێویستیشی لە بەردەمدا زەق کردووەتەوە، تا وای لێ هاتووە کە هەوڵ و کۆششی حەڵاڵ ناتوانێت ئەرك و نەفەقەی ئەو پێداویستییانە بگرێتە ئەستۆ، بۆیە - ئەم شارستانێتییە - لە ئەنجامدا هانی مرۆڤی دا کە بە ناچاری دەست بداتە ساختە و فڕوفێڵ و، نوقمی حەرام ببێت!

ئا لێرەوە بناغەکانی خووڕەوشت هەڵوەشان، چونکە هەروەك ئەو هەژارییە سەختەی بۆ مرۆڤ ڕەخساند، لە هەمان کاتدا سام و شکۆیەکی مەزنی بۆ خۆی ساز دا لە بەرچاوی کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا و، سەروەت و سامانی خەڵکیشی لە دەستی خۆیدا کۆ کردەوە، تا لە ئەنجامدا مرۆڤی سەردەم هەروەك گرفتاری "هەژاری" بوو، ڕەوشتی بەرزیشی لەدەست دا!

شایەتی زۆریش لەسەر ئەم دەرەنجامە بەدەستەوەیە، بە ڕادەیەك کە کۆی ئەو ستەم و تاوان و خیانەتانەی لە سەدەکانی پێشینەوە تا ئێستا لەناو گرۆی مرۆڤدا ڕوویان داوە، هەموویان بە یەك جار شارستانێتیی نوێ ڕۆی کردن و لە

گەرووی خـۆیەوە ڕشـاندنیەوە. لە ڕۆژگـارانی داهـاتوودا دووچـاری گەلـێ ڕشانەوەی تریش دەبێت[١].

ئـا لێـرەدا تێـدەگەین کە بـۆچی جیهـانی ئیسـلامی سسـت و دوودڵە لە وەرگرتنی شارستانێتیی ئاوەهادا.. بەڵێ، ئەم بێزهاتنەوەیەی جیهانی ئیسلامی لە وەرگرتنـی ئەم شارسـتانێتییە، واتـا و نـاوەرۆکێکی ئەوتـۆی تێـدایە کە شـایانی سەرنجدان و تێڕامانە!

بەڵێ، ئەو "نووره ئیلاهی"یەی کە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەیە، تایبەتکاریی "سەربەخۆیی" پێ دەبەخشێت، کە ئەویش دەیگەیەنێتە ئاستی بێنیازی لە شـتی تر. هەر تەنها ئەم تایبەتکارییەیە کە بوار بە "دەهاء"ی[٢] ڕۆما نادات - کە گیـانی ئەم شارستانێتییە نوێیە دەنوێنێـت - خـۆی لەو نـووره ئیلاهیـیەدا بسـەپێنێت و، نایەڵێت تێهەڵکێش و ئاوێتەی ببێت.

بەڵێ، هەرگیز "شـەریعەت" نـابێتە شـوێنکەوتەی ئەو "دەهـاء"ەی ڕۆمـان. چـونکە "شـەریعەت" شـەفەقەت و عیـززەتی ئـیمان لە گیـانی موسـڵماناندا پەروەردە دەکـات و پێـی دەگەیەنێـت، ئەوەتـا قورئـانی پیـرۆز حەقیقەتەکـانی شـەریعەتی بە دەسـتەوە گرتـووە، کە هەریەکەیـان لە دەسـتی ئەودا وەکـو عەساکەی حەزرەتی مووسا وایە. بە پشتیوانیی خوای گەورە ڕۆژێـك دێـت کە ئەو شارستانێتییە سیحربازە جـادووگەرە بە تەواوەتی سـەری سـوژدەی ڕێـز و نەوازش و سەرسووڕمانی بۆ دادەنەوێنێت!

---

(١) واتە لەمەولا ڕشانەوەی سەخت و چەپەڵتری دێتە ڕێ، ئەوەبـوو دوو جەنگـی جیهـانیی وەهای ڕشاندەوە کە دەریا و وشکایی و هەوای گۆی زەویی چەپەڵ کرد و سەرانسەری دنیای گرتەوە. (دانەر)

(٢) مەبەست بە وشەی "دەهاء": گشت ئەو چەمك(مفـاهیم)ە ماددیـانەیە کە شارسـتانێتیی خۆرئاوا، یان بیری ماددی لە فەلسەفەی خۆرئاوادا لە ئامێزی گرتوون. ئەم وشەیەشـمان وەك خۆی هێشتەوە، چونکە لەگەڵ وشەی "هودا" جیناسێکی قەشەنگ پێکدەهێنن. (وەرگێڕ)

فەرموو ئێستا بۆ خۆت بە وردی سەرنجی تێڕامان ئاراستەی ئەم ڕاستییەی خوارەوە بکە:

"ڕۆمان" و "یۆنان"ی دێرین هەردووك خاوەنی دەهاء(زیرەکی)ێکی ئەوتۆ بوون کە وەکو منالّی دوانە لە یەك سەرچاوە و بناغەوە لەدایك بووبوون و سەریان هەلّدابوو. ئەم دوانە، یەکێکیان ئەندێشەی بەسەردا زالّ بووبوو، ئەوی دیکەشیان ماددەی دەپەرست..

جا وێڕای تێپەڕبوونی کات و، هەولّدانی شارستانێتی و، تەقەلا و کۆششی "ئایینی نەصرانی"ش بۆ تێکەلّکردنی ئەم دوانە و تواندنەوەیان لە یەکتریدا، کەچی سەرجەمی ئەو هەولاّنە مایەپووچ مانەوە و، بە چەشنی تێکەلّنەبوونی ڕۆن و ئاو، هیچ کام لەم دوانە ئاوێتەی ئەوی تر نەبوو، بەلّکو هەریەکەیان پارێزگاریی سەربەخۆیی و جیاوازیی خۆی کرد!

وا ئێستا ئەو دوو "گیان"ە جەستەکانی خۆیان گۆڕیوە و، "ئەلّمان" بووە بە لەشی یەکێکیان و "فەرەنسی"یەکانیش بوون بە جەستەی ئەوی تریان، دەلّێی ئەو دوو گیانە لەواندا نیشتەجێ بوون!

بەم جۆرە، ڕۆژگار دەریخست کە "دەهاء"ی دوانەی ڕۆمان و یۆنان بە توندی دەستیان بە ڕووی هەموو هەولّ و هۆکارێکی ئاوێتەکردنەوە نا و، تا ئێستاش هەر پێکەوە نەگونجاون و دەستیان لە ملی یەکتری نەئالاندووە.

لە کاتێکدا کە دوو برای دوانە و هاوڕێی یەکتر لە گەشەکردن و بەرەوپێشچووندا، تا ئێستا بەم چەشنە لە ململانێدا بووبێتن و دەستیان لە ملی یەکتری نەکردبێت، ئەدی چۆن ئیتر "هودا"ی قورئان - کە لە ڕەچەلّەك و بناغەیەکی جیاوازە و لە هەلاّتگەیەکی ترەوە هەلّهاتووە - تێکەلّ بە "دەهاء" و فەلسەفەی ڕۆما دەبێت؟ لە کاتێکدا کە سەرچاوەی ئەو "دەهاء"ە جیایە لە سەرچاوەی ئەم "هودا"یەی قورئان؟ چونکە:

"هودا" لە ئاسمانەوە نازلّ بووە.. بەلاّم "دەهاء" لە زەوییەوە دەرچووە..

بواری دەستبەکاریی "هـودا" لە "دڵ"دایە و، "مێشـك و ژیـری" بـۆ کـار و کۆشش هان دەدات.. کەچی "دەهاء" تەنها لە بیر و مێشکدا دەسـت بەکـارە و، بـێگەردی و سـاف و خـاوێنیی دڵ ناهێڵێـت و لێڵـی دەکـات و سـەری لـێ دەشێوێنێت..

"هـودا" بە ڕادەیەکی ئەوتـۆ "گیـان" ڕوونـاك دەکـاتەوە کە بەری گـوڵ بە دەنکەکانی دەبەخشێت و لەم ڕێیەوە شەوەزەنگی تاریکی "سروشت" دەبێـت بە ڕۆژی ڕووناك و، سەرجەمی توانـا و لێهاتنەکـانی مـرۆڤیش بەرەو کەمـاڵ بەرز دەبـــنەوە و، ئنجـــا ئەم هـــودایە "دەروون"ی جیســـمانیش دەکـــات بە خزمەتگوزارێکی گوێڕایەڵ و، لە ئەنجامدا وێنە و ڕوخساری "مەلائیکەت"ێـك لە سەروسیمای مرۆڤی هەوڵدەری تێکۆشەردا دەنەخشێنێت..

بەڵام "دەهاء" پێش هەموو شتێك ڕووی لە "دەروون" و "جەسـتە"یە و، دەم لە "سروشـــت" بـــا دەدات و، دەروونی مـــاددیش دەکـــات بە کـێڵگەی گەشـــە پێکردنی توانا و لێهاتنە نەفسانییەکان و، لە ڕۆڵی "خزمەتکار" بەولاوە هیچی تر بە "گیان" نابەخشێت. تاکو لەم ڕێیەوە تـۆو و دەنکەکـانی سـیس دەبـنەوە و بە تەواوەتی وشك دەبن. ئیتر لە ئەنجامدا شێوەی "شـەیتان"ێـك لە سەروسـیمای مرۆڤدا دەچەسپێنێت!

"هودا" - لە هەردوو دنیادا - بەختەوەری بە مرۆڤ دەبەخشـێت و ڕوونـاکی لە هەردوو ژیانیدا پەخش دەکات و بەرەو پێشی دەبات.. بەڵام "دەهـاء"ی یەك چاوەی دەجاڵ ئاسا پێی وایە ژیـان تەنهـا یەك خـانە و لانەی هەیە کە ئەم دنیـا بەرچاوەی ئێرەیە. لەبەر ئەوە، هێندە بۆ ژیـانی دنیـا پـاڵ بە مـرۆڤەوە دەنێـت و هانی دەدات تا دەیکات بە پەرسـتکار و بەنـدەی مـاددە و دڕنـدەی خـوێنمژی زەوتکاری ستەمکار..

بەڵێ، "دەهاء": "سروشت"ی کەڕوکاس دەپەرستێ و گـوێڕایەڵیی "هێـز"ی کتوکوێر دەکات..

بەڵام "هـودا"؛ سـنعەتی خـاوەن هەسـت و شـعوور دەناسـێت و، ڕێـزی شایانیش لە توانستی دانایانەی خواوەند دەگرێت..

"دەهــــاء" بە پەردەی ناشـــکوری و ســـپڵەیی و پێـــنەزانی، ڕووی زەوی دادەپۆشێت.. کەچی "هـودا" نـووری شـوکرانە و پێـزانین و ئەمەکـداریی تێـدا پەخش دەکات.

لەبەر ئەم نهێنییەیە کە:

"دەهاء" کەڕوکوێرە و.. "هودا"ش بیسەر و بینایە!

چونکە:

لە ڕوانگەی ئەو دەهائەوە نیعمەتە پەرش و بڵاوەکانی سەر ڕووی زەوی بێ خـاوەنن و سـەرپەرشـتیکارێکیان نیـیە چاودێرییـان بکـات، بـۆیە بـێ هـیچ سوپاس و پێزانینێك هەڵمەتیان بۆ دەبات و زەوتیان دەکات. چونکە بەرچنـی و بەهرەوەرگرتن لە "سروشت" هەستێکی ئاژەڵانە لە مرۆڤدا دەڕوێنێت..

بەڵام لە ڕوانگەی هوداوە سەرجەمی نیعمەتە زۆر و بڵاوەکانی سـەر گـۆی زەوی، بەروبـوومی میهرەبـانیی خواوەنـدن و، لە پشـتی هەمـوو یەکێکیـانەوە دەستی بەخشندەی چاکەکار و میهرەبان دەبینێت. دیارە ئەم چەشـنە ڕوانیـنەش هانی مرۆڤ دەدات کە بە شوکرانە و ڕێز و نەوازش ئەو دەسـتە مـاچ بکـات و نیعمەتەکانی لێ وەربگرێت!

جـگە لەمـانەی کە بـاس کـران، دەبـێ ئەوەش پشـتگوێ نەخەیـن کە ئەم شارسـتانێتییە گەلـێ چـاکەشی تێـدایە، بەڵام دەبـێ بـزانین ئەو چاکەکارییـانە بەرهەمـی ئەم ســـەردەمە و هـی ئەو شارسـتانێتییە نـین، بەڵکـو بەرهەمـێکی جیهانییە و موڵکی سەرانســەری گـرۆی مـرۆڤە. چـونکە لە ئەنجـامی بە دوای یەکداهاتن و ئاوێتەبوونی بیروبۆچوونەکانی هەموو گـرۆی مـرۆڤ هەر لە دێـر زەمانەوە تاکو ئێستا و، بە هاندانی شەریعەتە ئاسمانییەکان بە تایبەت شەریعەتی محەممەدی - علی صاحبِها الصلاةُ والسـلام - سـەریان هەڵـداوە و گەشـەیان

کردووە. کەواتە ئەو چاکەکارییانە کەرەسەیەکن لە ئەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕانەوە پەیدا بوون کە ئایینی ئیسلام لە ژیانی مرۆڤایەتیدا بەرپای کردن. هەر لەبەر ئەوەشە کە هیچ کەسێك ناتوانێت بە موڵکی خۆی لە قەڵەمیان بدات.

ئا لێرەدا سەرۆکی ئەنجومەن پرسیارێکی تری ئاراستە کردم و، وتی:

ئەی مرۆڤەکەی ئەم چەرخ و سەردەمە!

بەڵا و گیروگرفتەکان هەمیشە لە تۆڵە و سزای خیانەتدا نازڵ دەبن و، لە هەمان کاتیشدا هۆی دەستکەوتنی پاداشتن. ئنجا "قەدەر"ی خوای گەورە زللەی خۆی لێ وەشاندن و "قەزا"یش بەسەر ئەم نەتەوەیەدا داباری..

جا ئایا ئێوە بە چ کردارێکتان ڕێتان بە قەزا و قەدەر دا کە گیروگرفتی ئاوەهاتان بهێنێتە ڕێ و دووچاری تەنگانەتان بکات، چونکە هۆی داباریني موسیبەت و گیروگرفتە گشتییەکان، هەڵە و تاوانی زۆربەی خەڵکییە؟

وتم:

گومڕایی و، سەرسەختیی نەمرووادانە و، لەخۆباییبوونی فیرعەون ئاسای گرۆی مرۆڤ لەم سەردەمەدا، هێندە فوویان تێ کرا تا گەیشتنە ئاسمان و، دەمیان لە حیکمەتی بەدیهێنان وەشاند و، چەندین شتی هاووێنەی تاعوون و تۆفان و بەڵا و موسیبەتی (وەك ئەم جەنگە جیهانییەی ئێستایان) لە ئاسمانە بەرزەکانەوە بەسەر گرۆی مرۆڤدا داباراند. ئەوەبوو خوای گەورە زللەیەکی توندی لە سەر و گوێلاکی شوێنکەوتووانی ئایینی نەصرانی، تەنانەت لە سەرجەمی مرۆڤایەتی وەشاند. چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم بەڵایە - کە هەموو خەڵکیی تێدا بەشدارن - بریتییە لە گومڕایی بەرهەمی بیری ماددی و.. سەربەستیی ئاژەڵانە و.. خۆسەپاندنی هەوا و ئارەزووەکان.

ئنجا ئەو هۆکارەش کە لە لایەنی ئێمەوە بوو بەهۆی نازڵبوونی ئەم بەڵایە، پشتگوێ خستنی پایەکانی ئیمان و، وازهێنانمان بوو لە ئەنجامدانی فەرزەکان!

چـونکە خـوای گەورە داوای لـێ کـردین کە لە مـاوەی بیسـت و چـوار سەعاتدا، تەنها یەك سەعات - لە پێنـاوی سـوودی خۆمانـدا - بـۆ بەجێهێنـانی فەرزەکان تەرخان بکەین. کەچـی ئـێمە سسـتیمان لەم ئەرکەدا نوانـد و بە بـێ ئاگایی پشتگوێمان خست. بۆیە خوای گەورەش، لە تۆڵەی ئەمەدا، بە مەشق و تەدریبێکی سەختی بیست و چوار سـەعاتی و بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵی یەك لە دوای یەك سـزای دایـن. واتە ناچـاری بەجێهێنـانی جـۆرە نـوێژێکی تـایبەتیی کردین..

هەروەها ئەو خواوەندە مەزنە بەزەیی بە ئێمەدا هاتەوە و، داوای لـێ کـردین کە تەنها یەك مانگ لە سەرانسەری سـاڵدا بەرۆژوو ببـین. کەچـی لەبەر ئەوەی دەروونی خۆمانمان بەلاوە ئازیز بوو، ئەو فەرمانەی خوای گەورەمان جێبەجێ نەکرد. خوای گەورەش، لە سزای ئەم سەرپێچییەدا و بۆ کەفارەتی ئەو گوناهە، ناچاری ڕۆژوویەکی پێنج ساڵیی کردین!

هەروەها خوای گەورە داوای لێ کردین کە یەك لە دە، یان یەك لەسەر چلی ئەو ماڵ و سامانەی خۆی، کە بە ئەمانەت لای ئێمە دایناوە، بە ناوی زەکـاتەوە دەربکەین. کەچی ئێمە چرووکیمان نوانـد و، سـتەممان لە خۆمـان کـرد و، بە ڕەزامەندیی خۆمان ئەو ئەندازە دیاریکـراوەمان نەبەخشـی و، تێکەڵـی مـاڵی حەرامەمان کرد. لە تۆڵەی ئەمەشدا ناچـار کـراین کە زەکـاتی کەڵەکەبـووی ئەو ماوەیە بە یەك جار دەربکەین و، لەو ڕێیەوە لەو حەرامە ڕزگـار کـراین، بەپێـی ئەو یاسایەی کە دەڵێت: "الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ الْعَمَلِ"..

چونکە کردەوەی چاك دوو جۆرە:

یەکێکیان: ئیجابی و ئیختیارییە.. ئەوی تریان: سەلبی و ناچارییە.

جا بە گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ سەرجەمی بەڵا و موسیبەتەکان لەم جۆرەی دووهەمن؛ کردەوەی چاکی سەلبی و ناچارەکین. دیـارە ئەمەش دەبـێ بە مایەی دڵنەوایی و دڵدانەوەی ئێمە!

کەواتە، ئەم نەتەوە گوناهبارە، لە گوناهەکانی پاك بووەوە و، دەستنوێژی بە خوێنی خۆی گرت و، بە کردار و ڕەفتار تەوبەیەکی ڕاستەقینە و تەواوی ئەنجام دا.

پاداشتی پێشەکی و زووبەزووی ئەم تۆبە و پەشیمانییەش بریتی بوو لەوەی کە پێنج یەکی ئوممەتی عوسمانی - واتە چوار ملیۆن کەس- پلەی موجاهیدی و شەهیدییان پێ بەخشرا و، لەم ڕێیەوە بۆ پایەی ویلایەت بەرز کرانەوە و، بەم چەشنە کەفارەتی گوناهەکانی دا!

گشت ئامادەبووانی ئەنجومەنە بەرزە میسالییەکە، ئەم وەڵامەیان پەسەند کردم.

دوای ئەمە، لە خەونەکەم بێدار بوومەوە. بەڵکو لە ڕاستیدا بەم بێداربوونەوەیەم سەرلەنوێ خەوم لێ کەوتەوە! چونکە لەو باوەڕەدام کە بێداری نوستنە و، نوستنیش جۆرێکە لە جۆرەکانی بێداری!

**سەعیدی نوورسی** (لێرە)
**نوێنەری سەردەم** (لەوێ)

* * *

## ئەگەر "مەجاز" بکەوێتە دەستی "نەزانی" بە "حەقیقەت"ی دادەنێت

ئەگەر "مەجاز" لە دەستی زانستەوە بکەوێتە دەستی نەزانی، بە "حەقیقەت"ی دادەنێت و دەرگای چەندەها ئەفسانەشی پێ دەخاتە سەرپشت.

جارێکیان لە تافی منالیمدا دیاردەی مانگگیرانم دی، کاتێ هۆکەیم لە دایکم پرسی، وتی: هەژدیها قووتی داوە! وتم ئەدی بۆچی دەبینرێت؟ وتی: جەستەی هەژدیهای ئەوێ تەنکە و تا ڕادەیەك ئەودیوی دەردەکەوێت!

بەم جۆرە و بە گومانی مرۆڤ "مەجاز" وەك "حەقیقەت" وەرگیرا و تەماشا کرا..

چونکە کاتێك مانگ بە فەرمانی خوا دەگیرێت، لە دوو خاڵی یەکتربڕینی خولگەی خۆر و مانگدا - کە بریتییە لە "سەر" و "کلك"ی ئەو خولگانە - زەوی دەکەوێتە نێوان هەردووکیانەوە.

دەبینیت ئەو دوو کەوانە وەهمییە، کە بەپێی تەشبیهێکی ئەندێشەیی ناوی هەژدیهای لێ نراوە، لای عەوام بووە بە ناو بۆ هەژدیهایەکی ڕاستەقینە!

* * *

## موبالەغە لە مەدحدا زەمکردنێکی پەنهانە!

ئەگەر وەسفی هەر شتێکت کرد وەك خۆی وەسفی بکە. چونکە من لەو باوەڕەدام کە زیادەڕەوی لە مەدحکردندا زەمێکی ناوەکی و پەنهانە. دڵنیابە کە هیچ شتێك چاکتر نییە لەو چاکەیەی کە خوای گەورە بەخشیویەتی!

* * *

## "ناوبانگ" ستەمکارە!

"ناوبانگدەرکردن" ستەمکارێکی خۆسەپێنە؛ چونکە "ناوبانگدەرکراوەکە" دەکات بە خاوەنی شتێك کە هی ئەو نییە!

بۆ نموونە: خواجە نەسرەددین(مەلای مەشهوور) خاوەنی تەنها یەك لە دەی ئەو قسە نەستەقانەیە کە دراونەتە پاڵی و بە ناویەوە بڵاوبوونەتەوە.

هەروەها ئەو خەرمانەی ئەندێشە و خەیاڵەی کە چواردەوری ڕۆستەمی سیستانیی گرتبوو، شانازی و قارەمانێتیی ماوەی یەك چەرخی ڕەبەقی ئێرانییەکانی بۆ خۆی زەوت کرد!

بەڵێ، ئەم زەوتکارییەی کە لەناوبانگدایە، هێندە فووی تێکراوە تـا ئـاوێتەی ئەفسانە بووە و پاشان مرۆڤی پێوە گیرۆدە کراوە.

* * *

## ئەوانەی "ئایین" لە "ژیان" دادەماڵن گرفتاری تیاچوون دەبن

هەڵەی "تورکیای لاو"[١] لەوەدا بوو کە نەیانـدەزانی ئـایین بنـاغەی ژیـانە؛ پێیان وابوو: نەتەوە شتێکە و ئیسلامیش شتێکی تری جیاوازە!

هۆکار و هاندەری ئەم هەڵەیەشیان شارستانێتیی سەردەم بوو کە ئەو چەشنە بۆچوونەی بڵاو دەکردەوە و، بەوەی کە دەیوت: "بەختەوەری تەنها لە ژیاندایە" بەسەر بیری خەڵکیدا زاڵ بووبوو.

بەڵام ڕۆژگـار دەری خسـت کە ڕێسـای ئەم شارسـتانێتییە، بـێ کەڵـك و زیانبەخشە[٢]!

ئنجا تاقیکردنەوە بێگومانەکانیش چەسپاندیان کە "ئایین" ژیان و ڕووناکی و بناغەی "ژیان"ە..

زینـدووکـردنەوەی ئەم نەتەوەیە بە ژیانـدنەوەی ئـایین دەبێـت، هەر تەنهـا ئیسلامیش پەیی بەم ڕاستییە بردووە.

ئەنـدازەی بەرەوپێشـــچوونی نەتەوەی ئـێمە بە ڕێـژەی دەســتگرتنیەتی بە ئایینەوە و، مەودای دواکەوتن و نزمبوونەوەشی بە ئەندازەی پشـتگوێ خسـتنی ئایینەکەیەتی.. بە پێچەوانەی ئایینەکەی تر!

---

(١) تورکیای لاو" یان "جـۆن تـورك" بەو کـۆمەڵ و تـاك تاکـانە دەوترێـت کە لە سـەردەمی سـوڵتان عەبدولعەزیزەوە تاکو لەسـەرکار لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید لە سـاڵی ١٩٠٩زدا دژ و نەیاری ڕژێمی فەرمانڕەوا بوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا. لە هەموویان بەهێزتر کـۆمەڵەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بوو، کە توانییان سوڵتان عەبدولحەمید لەسەر کار لابدەن. (وەرگێڕ)

(٢) ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ شارستانێتیی مولحیـدی سـتەمکار کە ئێسـتا بە ئـازاری سەرەمەرگەوە گیرۆدەیە! (دانەر)

ئەمەش ڕاستییەکی مێژووییە، لە بیر براوەتەوە.

* * *

## "مردن" ترسناك نییە، وەك ئەوەی گومان دەبرێت

"مردن": جێگۆڕین و دەربازبوونە لە بەندیخانە و، ڕۆشتنە بەرەو باخ و بێستان و گوڵزارەکان..

کەواتە ئەو کەسەی عەوداڵی ژیانە با بە دوای شەهیدیدا بگەڕێت!

قورئانی پیرۆز بە ڕاشکاوی دانی بە ژیانی شەهیددا ناوە.

شەهید، کە ژانی سەرەمەرگی نەچەشتووە، پێی وایە هێشتا لە ژیاندایە و نەمردووە، بەڵام هەست دەکات ژیانی تازەی لەچاو هی پێشوویدا گەلێ خاوێنترە.

جیاوازیی نێوان شەهیدان و مردووانی تر، وەك هی ئەم نموونەیەی خوارەوە وایە:

دوو کەس خەون دەبینن و، هەردووکیشیان لە خەونەکەیاندا گەشتی ناو باخێکی ڕەنگینی پڕ لە میوەی جۆراوجۆری بەتام و لەزەت دەکەن.. بەڵام یەکێکیان دەیزانی ئەوەی دەیبینێت خەونە، بۆیە چێژی زۆری لەو گەشتەی نەبرد، لەوانەیە خەمیشی خواردبێت. کەچی دووهەمیان وا نەبوو؛ نەیدەزانی ئەوەی دەیبینێت خەونە، بەڵکو پێی وابوو لە جیهانی ڕاستی و بێداریدایە، بۆیە چێژی ڕاستەقینەی لە خەونەکەی دەبرد.

"خەون" سێبەری جیهانی میسالە و، جیهانی میسالیش سێبەری جیهانی بەرزەخە.. لەیەکترچوونی دەستوورەکانی ئەم چەشنە جیهانانە هی ئەم نهێنییەیە.

* * *

## "سیاسەت"ی ئەم ڕۆژگارە لە جیهانی بیروڕاکاندا: "شەیتان"ە؛ دەبێ "أعُوذُ باللّٰه"ی لێ بکرێت!

سیاسەتی شارستانێتیی نوێ دەچێت لە پێناوی کەمایەتیدا قوربانی بە زۆربەی خەڵکی دەدات، تەنانەت چەند کەسێکی یەکجار کەمی ستەمکار، جەماوەرێکی زۆری خەڵك لە پێناوی هێنانەدیی ئامانجەکانیاندا بەخت دەکەن!

بەڵام "دادگەریی قورئانی پیرۆز" خوێن و ژیانی تەنها یەك کەسی بێتاوان نە لەبەر هیچ شتێك و نە لە پێناوی زۆرینەدا و نە لە پێناوی سەرجەمی گرۆی مرۆڤایەتیدا، بەخت ناکات. چونکە ئایەتی پیرۆزی: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَو فسادٍ في الأرضِ فكأنَّما قَتَلَ النّاسَ جَميعاً﴾ (المائدة:٣٢) دوو نهێنیی مەزن لە بەردەم مرۆڤدا دادەنێت:

**یەکەم:** دادگەریی پەتی(العدالة المحضة) کە دەستوورێکی هێندە مەزنە بە یەك ڕوانین سەیری تاك و کۆمەڵ و یەك کەس و سەرجەمی مرۆڤایەتی دەکات. هەروەك بەدیهێنانی هەموو ئەوانە بۆ توانستی خوا یەکسانە، بە هەمان جۆر لە بەردەم دادگەریی خوای گەورەشدا هەموویان یەکسانن.

ئەوەندە هەیە کە مرۆڤ بە ویست و ئارەزووی سەربەستانەی خۆی دەتوانێت لە پێناوی ئامانجی بەرزدا خۆی بەخت بکات، بێ ئەوەی یەکێکی تر قوربانیی پێ بدات و بەختی بکات، با لە پێناوی سەرانسەری مرۆڤایەتیشدا بێت! چونکە ڕشتنی خوێن و نەهێشتنی عیصمەت و کۆتاییهێنان بە ژیانی هەر کەسێك وەك ئەوە وایە کە خوێنی هەموو خەڵکی ڕژابێت و عیصمەتی هەموویان پێشێل کرابێت!

**نهێنیی دووهەم:** ئەگەر یەکێکی لەخۆبایی، بێ هیچ سڵەمینەوە و بەربەستێك، لە پێناوی هێنانەدیی قسەی خۆیدا و بۆ مەبەستی تێرکردنی هەوا و ئارەزووەکانی، بێ پەروا، مرۆڤێکی بێتاوانی کوشت، ئەوا هەر ئەو مرۆڤە

ئامادەیە سەرانسەری جیهانیش بفەوتێنێت، گەر بیشتوانێت ئامادەیە ڕەگەزی مرۆڤ لە ڕووی زەویدا قەلاچۆ بکات!

* * *

## دەرخستنی "لاوازی"، دوژمن "ئازا" دەکات!

ئەی ترسنۆکی لاواز!

"ترس" و "لاوازی"ت هیچ سوودێکیان تێدا نییە، تەنانەت زیانیشت پێ دەگەیەنن. چونکە خەڵکیت لێ هان دەدەن و بە گورگانخواردت دەدەن و ئیشتیهای دڕندەییان تێدا دەبزوێنن. هەر ئەوەندەی خەڵکی بە لاوازی و ترسنۆکیی تۆیان زانی، یەکسەر لێت ڕادەپەڕن و لەناوت دەبەن!

* * *

## خوای گەورە بۆی هەیە بەندەی خۆی تاقی بکاتەوە، بەڵام بەندە مافی تاقیکردنەوەی پەروەردگاری خۆی نییە

دەسا ئەی مرۆڤی دوودڵ!

هەرگیز لە پێناوی زیانێکی وەهمیدا بەرژەوەندییەکی مسۆگەر بەخت ناکرێت. کەواتە ئەرکی سەرشانی تۆ لەوەدایە کە تێبکۆشیت و ئەنجامی تێکۆشانەکەشت بە خوای گەورە بسپێریت. چونکە خوای گەورە بۆی هەیە بەندەی خۆی تاقی بکاتەوە و پێی بڵێت: گەر فلانە کارت جێبەجێ کرد فیسارە پاداشتت دەدەمەوە. بەڵام هەرگیز بەندە مافی تاقیکردنەوەی پەروەردگاری نەدراوەتێ و بۆی نییە بڵێت: دەبا خوای گەورە لەم کارەدا پشتم بگرێت تاکو منیش فلان کردەوەی چاك ئەنجام بدەم. خۆ ئەگەر گوفتاری وای لە زار دەربچێت، ئەوا سنووری خۆی دەشکێنێت.

ڕۆژێکیان شەیتانی لەعنەتی بە حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمی وت[١]:
مادەم جڵەوی هەموو کارێك بە دەستی خوایە و، هەر شتێکی لە چارەت نەنووسیبێت تووشت نایەت، ئەوا لەسەر لوتکەی ئەم چیایەوە خۆت فڕێ دەرە خوارەوە، بزانە چیت بەسەر دێت!
حەزرەتی عیسا - درودی لەسەر بێت - فەرمووی:
(لەعنەتی! خوا بۆی هەیە بەندەی خۆی تاقی بکاتەوە، بەڵام بەندە بۆی نییە پەروەردگاری خۆی تاقی بکاتەوە)!

* * *

## حەزت لە هەر شتێك کرد، زیادەڕەویی تێدا مەکە

هەندێ جار دەرمانی نەخۆشییەك دەردە بۆ نەخۆشییەکی تر و، مەڵهەمە شیفا بەخشەکەی لەوێدا دەبێت بە ژەهرێکی کوشندە. چونکە دەرمان گەر زیاد لە پێویست بەکار بهێنرێت، هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێت بە دەرد و نەخۆشی.

* * *

## چاوی عیناد "مەلائیکەت" بە "شەیتان" دەبینێت!

سروشتی سەرسەختی(عیناد) وەهایە کە:
ئەگەر "شەیتان"ێك یارمەتیی کەسێك بدات، دەڵێت: ئەوە "مەلائیکەت"ە و، ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت.. بەڵام ئەگەر "مەلائیکەت"ێك لە ڕیزی ئەو کەسانەدا ببینێت کە ڕایان لەگەڵ ئەمدا جیایە، دەڵێت: ئەوە "شەیتان"ە بەرگ و پۆشاکی خۆی گۆڕیوە! ئنجا دەست بە دوژمنایەتیی دەکات و لەعنەتی بۆ دەنێرێت!

* * *

(١) بڕوانە: (أدب الدنيا والدين، لأبي الحسن علي بن محمد الماوردي، تحقيق مصطفى السقا. ص٢٧. الطبعة الثانية). (وەرگێڕ)

**ئەگەر "حەق"ت دۆزییەوە، لە پێناوی "حەقتر"دا ئیختیلاف مەنێرەوە!**

ئەی مرۆڤی حەقویست!

ئەگەر یەکگرتن لەسەر "حەق" بە یەکنەگرتن دەبوو لەسەر "حەقتر"، ئەوا "حەق" حەقتر دەبێت لە "حەقتر"و، "جوان"یش جوانتر دەبێت لە "جوانتر"!

ئیسلام ئایینی ئاشتی و ئاسایشە، بە ناکۆکی و مشتومڕی ناوخۆ ڕازی نابێت.

ئەی جیهانی ئیسلامی! بزانە ژیانت لە "یەکگرتن"دایە..

گەر تۆ داواکاری یەکگرتنیت ئەوا دەستووری:

(ئەمە "حەقە" لە بریی "هەر ئەمە حەقە" و.. ئەمە "جوانە" لە بریی "هەر ئەمە جوانە"..)..

بکە بە ڕێبازی ژیانت!

چونکە هەموو موسڵمانێك دەتوانێت سەبارەت بە ڕێباز و مەزهەبەکەی خۆیەوە بڵێت:

(ئەم ڕێبازە حەقە و کارم بەسەر ڕێبازەکانی ترەوە نییە. خۆ ئەگەر ڕێبازەکانی تر جوان بن، من پێم وایە ئەمەی خۆم جوانترە).

بەڵام مافی ئەوەی نییە بە ڕێبازەکەی خۆی بڵێت:

(تەنها هەر ئەم ڕێبازە حەقە و ئەوانی تر ناحەقن.. هەر تەنها ئەمەی من جوانە، ئەوانی تر ناشیرینن)!

زەین تەسکیی مرۆڤ و قەتیسبوونی لەسەر یەك شت، ئەنجامی خۆشویستن و لێ ڕازی بوونی نەفسە. پاشان هەر ئەم ڕەفتارەشە کە دەبێت بە دەرد و، لەویشەوە دووبەرەکی و مشتومڕ پەیدا دەبێت.

بەڵام دەبێ بزانین کە:

دەرمانەکان هەموویان یەك نین، بەڵکو بەپێی جیاوازیی نەخۆشییەکان جیاجیان، ئەم جیابوونەشیان کارێکی حەق و ڕەوایە.. کەواتە "حەق" یەك دانە نابێت، بەڵکو دەکرێت چەند دانەیەکی جیاجیا بێت..

پێداویستی و خواردەمەنییەکانیش زۆر و جۆراوجۆرن، ئەم جۆراوجۆرییەش کارێکی ڕەوا و حەقە. کەواتە دەکرێ "حەق" جۆراوجۆر بێت..

توانا و لێهاتنەکان و هۆکارەکانی پەروەردە بەش بەش و لە یەکتر جیاوازن. ئەم بەش بەش بوون و جیاوازییەش کارێکی حەق و ڕەوایە. کەواتە دەگونجێ "حەق" بەش بەش بێت.

هەندێ جار تەنها یەك ماددە بەپێی دوو میزاجی جیاواز دەردیش دەبێت و دەرمانیش. بۆیە ڕێژەی پێکهاتووی جیاجیا لەو دەرمانە بۆ هەر یەکێك لەو نەخۆشانە و بەپێی جیاوازیی میزاجیان، دەستنیشان دەکرێت. کەواتە دەگونجێ "حەق" ئاوێتەیەکی پێکهاتوو بێت و، ئنجا هەر ئەم ئاوێتەیەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر بگۆڕێت.

هەموو خاوەن مەزهەبێك حوکمێکی ڕەها بەسەر مەزهەبەکەیدا دەردەکات و سنووری بۆ دەستنیشان ناکات و، ئەم کارە بۆ میزاجە جیاجیاکان بەجێ دەهێڵێت. کەچی دەمارگیریی مەزهەبی "تەعمیم" دروست دەکات و، ئنجا پابەندبوونیش بەم تەعمیمە کێشە و مشتومڕ دەهێنێتە کایەوە.

لە پێش ئیسلامدا کەلەبەری فراوان و قووڵ و دووریی یەکجار زۆر و سەرسووڕهێنەر لە نێوان چینەکانی مرۆڤدا هەبوو، بۆیە ئەو واقیعە داخوازی زۆریی ژمارەی پێغەمبەران بوو لە یەك کات و سەردەمدا، هەروەها پێویستی دەکرد کە شەریعەت و مەزهەبەکانیش زۆر و جۆراوجۆر بن.

بەڵام ئایینی ئیسلام ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا بەرپا کرد کە خەڵکی لە یەکتری نزیك بوونەوە و شەریعەتیش بوو بە یەك شەرع و تەنها یەك پێغەمبەریش ﷺ ڕابەرایەتیی سەرجەمی گرۆی مرۆڤی خرایە ئەستۆ.

هەرچی مەزهەبەکانیشە، ئەوا هەتا ئەو کاتەی ئاستی هەموو خەڵکی نەبێت بە یەك، هەر ئاوا زۆر و جۆراوجۆر دەبن. خۆ ئەگەر هەموویان یەکسان

بوون و ئاستیان بوو بە یەك و یەك "پەروەردە"ش سەروزیادی پێداویستییەکانی سەرجەمی خەڵکی بوو، ئەوا ئەو کاتە مەزهەبەکانیش دەبن بە یەك.

* * *

## بەدیهێنان و کۆکردنەوەی شتانی دژ بە یەك حیکمەتێکی مەزنی تێدایە.. "گەردیلە" و "خۆر" لە دەستی توانستدا یەکسانن

ئەی برای دڵ بێدارم!

توانستی خوای گەورە لە کۆکردنەوەی شتانی دژ بە یەکدا دەردەکەوێت..

چونکە نهێنییەکی مەزن هەیە لە بوونی:

ئازار لەناو لەزەتدا و.. شەڕ لەناو خێردا و.. ناشیرینی لە توێی جوانیدا و.. زیان لە ناوەندی قازانجدا و.. نەهاتی لە میانەی نیعمەتدا و.. ئاگریش لەناو نووردا.. دەزانیت بۆچی؟

بۆ ئەوەی ڕاستییە ڕێژەییەکان(الحقائق النسبية) بچەسپێن و جێی خۆیان بگرن.. هەروەها تاکو چەندین شتی زۆر و زەبەندەش لە تەنها یەك شتەوە پەیدا ببن و بێنە جیهانی "بوون".

بۆ نموونە: ئەگەر "خاڵ"ێك بە توندی و خێرایی بجووڵێنیت دەبێت بە "هێڵ"ێك و، گەر بریسکەیەکیش بخولێنیتەوە بازنەیەکی ڕووناکی پێکدەهێنێت.

ئەرکی سەرشانی "ڕاستییە ڕێژەییەکان" لە دنیادا بریتییە لەوەی کە دەبن بە چەند دەنکە تۆوێك و چەندەها گوڵ دەگرن، چونکە هەر ئەو ڕاستییانەن کە هەوێنی بوونەوەران و پەیوەندیی ڕێسا و نەخشونیگارەکانیان پێکدەهێنن.. بەڵام لەودنیادا، ئەم کاروبارە گوێرەییانە دەبن بە ڕاستیی تەواوەتی و ڕاستەقینە.

پلەکانی گەرما لە تێکەڵبوونی سەرماوە پەیدا دەبن و، پلەکانی جوانییش لە تێهەڵکێشبوونی ناشیرینییەوە دروست دەبن. واتە هۆکاری پەیدابوونی ئەو پلانە تێکەڵبوونی دژەکانیانە.

بۆ نموونە:

ڕووناکی قەرزاری تاریکییە و.. لەزەت منەتباری ئازارە و.. گەر نەخۆشی نەبوایە تەندروستی هیچ تام و چێژێکی نەدەبوو.. هەروەها گەر بەهەشتیش نەبوایە دۆزەخ نەدەبووە سزاخانە.. تەنانەت گەر زەمهەریر نەبێت دۆزەخیش نابێت بە دۆزەخی ڕاستەقینە، بگرە ئەگەر زەمهەریر نەبوایە دۆزەخ بە تەواوی هیچ شتێکی نەدەسووتاند!

جا ئەو بەدیهێنەرە ئەزەلییە، لە ڕێی بەدیهێنانی شتانی دژ بە یەکەوە، حیکمەتە مەزنەکەی خۆی دەرخستووە و سام و شکۆی لەم ڕێیەوە درەوشاوەتەوە..

هەر ئەو خاوەن توانستە هەمیشەییەش، بە کۆکردنەوەی شتانی دژ بە یەك، توانستی خۆی دەرخستووە و، لەم ڕێیەوە گەورەیی و مەزنایەتییەکەی ئاشکرا بوون.

مادەم ئەو توانستە خواییە شتێکی پێویستە بۆ زاتی مەزنی پەروەردگار، ئەوا دەبێت - بە پێویست و بەداهەت - ئەو زاتە "دژ"ی خۆی تێدا نەبێت و، کۆڵەواریی تێکەڵ نەبێت و، توانستەکەشی پلە پلە نەبێت و، سەرجەمی شتانی بەلاوە یەکسان بن و، هیچ شتێکی پێ قورس و گران نەبێت.

"خۆر" نموونەیەکە بۆ ئەو توانستە..

ئەوەتا خۆر بووە بە تاق و کڵاوڕۆژنەیەك بۆ ڕووناکیی ئەو توانستە و، ڕووی زەویش ئاوێنەیەتی. تەنانەت چاوی ئاورنگ و شەونمەکانیش ئاوێنەیەکی تری ئەو کڵاوڕۆژنەیەن.

چونکە ڕووی فراوانی دەریا ئاوێنەیەکی گەورەیە بۆ تیادەرکەوتنی خۆر، کتومت وەك ئەوەی کە بڵق و کەفی شەپۆلەکانی دەبن بەو ئاوێنەیە و خۆریان تێدا دەردەکەوێت، چاوی شەونم و ئاورنگەکانیش کە وەك ئەستێرە دەبریسکێنەوە و تریفە دەدەن.. هەموو یەکێك لەمانە، هەمان ڕووناکیی هەمان

خـۆر دەردەخەن. کەواتە دەریـا و شـەونم، هەردووکیـان بە لای خـۆرەوە یەکسانن..

توانستی خواوەنـدیش وەك ئەم نمـوونەیە وایە؛ چـونکە هەروەك بیلبـیلەی چاوی ئاورنگ و شەونم خـۆرێکی بچـووکە دەبریسـکێتەوە، خـۆری مەزنـیش شەونمێکی بچووکە و بیلبیلەی چاوەکانی لە خۆری توانسـتی خـوای گەورەوە روونـاکی وەردەگرێـت و، چەشـنی سـوورانەوەی مانـگ بە دەوری زەویـدا، ئەویش پابەندی ئەو توانستەیە و لە دەوریدا سوور دەخـوات.. ئاسـمانەکانیش دەریایەکی فراوانی بێ لێوارن و، بە فەرمانی خـوای میهـرەبان کەف و بڵقەکانی - کە ئەستێرە و خۆرەکانن - لەسەر ڕوویدا شەپۆل دەدەن.

بەم چەشنە "توانست" درەوشایەوە و، چەند بریسکەیەکی "نـوور"ی بەسـەر ئەو دڵۆپانەدا پەخشاند!

کەواتە هەموو خۆرێك دڵـۆپێکە و، گشـت ئەسـتێرەیەکیش شـەونمێکە و، هەموو بریسکەیەکیش وێنەیەکە..

جـا ئەو خــۆرە مەزنەی کە وەك دڵۆپێــك وایە، تیشــکدانەوەیەکی کــزی درەوشــانەوەی ئەو ڕێــژنە مەزنەی توانســتە، چــونکە تەنهـا بریسـکانەوەیەکی بچووکی ئەو ڕێژنەیە "خۆر" دەکات بە "ئەستێرەیەکی ڕووناکی بەخش"!

ئەو ئەســتێرەیەش کە وەك شــەونم وایە، لەنــاو چــاوی خۆیــدا ڕێــی ئەو بریســکەیە دەکاتەوە و، بەو پێیە خۆی دەبێت بە چرا و چاویشـی بە بلوورێکی ئەوتۆ کە ڕووناکیی زیاتر بە چراکە دەبەخشێت.

* * *

## تایبەتکارییەکانت لە ژێر خاکی "پەنهانی"دا بنێژە، با گەشە بکەن!

ئەی مرۆڤی خاوەن تایبەتمەندی!

بە "خۆدەرخستن" و "خۆقوتکردنەوە" ستەم لە کەس مەکە!

چـــونکە ئەگەر هەر لە ژێـــر پەردەی "پەنهـــانی"دا بوویتـــایە، ئەوا پیـــت و بەرەکەت و چاکەت بە برایانت دەبەخشـــی و، ئەو کاتە دەگونجـا لــە هــەموو برایەکتدا تۆ دەربکەوتیتایە و، ئەو تۆ بوایە! بەم جۆرە ڕێز و سەرنجی خەڵکیـت بۆ هەموو برایەکت ڕادەکێشا.

بەڵام ئەگەر خۆت دەربخەیـت و تایبەتکارییەکانـت ئاشـکرا بکەیـت، ئەوا دەکەویتە سێبەرەوە، کەچی لە حاڵەتی یەکەمدا خۆرێکی مەعنەوی بوویت. بـۆ خۆت بەم هەوڵەت لە شـان و شـکۆی هاوڕێیانـت دادەگریـت و ڕێزیـان کەم دەکەیتەوە. واتە: خۆدەرخسـتن و ئاشـکراکردنی تایبەتکـارییە خۆییەکـان، دوو کاری ناڕەوان و بە ستەم دادەنرێن.

لە کاتێکدا دەرخستنی تایبەتکارییە ڕاستەقینەکان ئاوا بێـت کە خـاوەنەکەی ڕاست دەکات، دەبێ هەوڵدان بۆ ناوبانگ یان ئەو چەشنە خۆدەرخستنە چـۆن بێـت کە ئەنجـامی ڕیـا و مەرایـی درۆزنـانەیە؟! کەواتە نهێنیـیەکی مەزن و حیکمەتێکی خوایی و ڕێسایەکی تەواو کامڵ لەوەدا هەیە کە:

یەك "دانە"ی ناو "جۆر"ێك - لە ڕێـی شـاردنەوە و پەنهـانبوونیەوە - نـرخ و بایەخ بە سەرجەمی دانە دانە و یەك بە یەکی تاکەکانی ئەو جۆرە دەبەخشێت!

ئەمانەی خوارەوە نموونەی ئەم ڕاستییەن:

"وەلی" لەنـاو مرۆڤـدا و.. "ئەجەل" لە تەمەنـدا، کە تـا ئێسـتاش نادیـارن.. هەروەها "سەعاتی گیرابوونی دوعـا" لە شـەو و ڕۆژی جـومعەدا و.. "شـەوی قەدر" لە ڕەمەزانـدا و.. "ئیسـمی ئەعـزەم" لە نێـوان نـاوە جوانەکـانی خـوای گەورەدا.

ئەو نهێنییە نیان و نرخ و بەها گرنگەی کە لە تـوێی ئەم چەشـنە نموونـانەدا هەن، بریتییە لەوەی کە:

(لە پەنهـانکردنی هەرشـتێکدا دەرخسـتن و.. لە شاردنەوەشـدا چەسـپاندن هەیە)!

بۆ نموونە: "پەنهانکردنی ئەجەل" هاوسـەنگییەکی ورد و ناسـکی لە نێـوان ترس و ئومێد(الخوف والرجـاء)دا ڕاگرتـووە، کە هاوسـەنگیی نێـوان وەهمـی مانەوەی ژیانی دنیا و، چاوەڕوانیی پاداشتی دواڕۆژە.

کەواتە تەمەنێکی ماوە نەزانراوی بیست ساڵی، گەلـێ باشـترە لە تەمەنـێکی هەزار ساڵیی دیاریکراو. چونکە دوای تەواوکردنی نیـوەی ئەو تەمەنە زانـراوە، مرۆڤ ژیانی وەکو ئەو کەسە لێ دەگوزەرێـت کە هەنگـاو بەرەو پەتی سـێدارە بنێت. واتە خەم و پەژارەی بەردەوامی ئەو کۆتاییە دەستنیشانکراوەی، نایەڵێـت لە چێژی حەوانەوە و شادمانی بەرخوردار ببێت!

هیچ میهر و سـۆزێك لە میهرەبـانیی خـوای گەورە فـراوانتر نـیـە و، هـیچ توورەیی و ڕقێکیش لە هی ئەو سەختتر نییە..

نە میهرەبـانی هەیە لە سـەرووی میهرەبـانیی خـوای گەورەوە بێـت و، نە توورەیی و ڕقیش هەیە لە هی ئەو توندوتیژتر بێت.

کەواتە گشـت کارەکـان بـۆ خواوەنـدی دادگەری میهرەبـان بەجێبهـێڵە، چونکە:

شەفەقەتی زیاد لە پێویست زیانبەخشە و..

ڕقی لە سنوور بەدەریش کارێکی بێکەڵکە.

* * *

## "ئیسراف" دەرگایە بۆ "هەرزەیی" کە ئەویش مرۆڤ بەرەو "نزمی" دەداتەبەر!

برای هەڵەخەرجم!

دوو پاروو خـۆراکی بەپێـزی سـوودبەخش بـۆ لەش، کە یەکێکیـان بە یەك قورش و ئەوی تریان بە دە قورش بێـت، هەردووکیـان پـێش ئەوەی بـڕۆنە نـاو دەمی مرۆڤەوە و، دوای تێـپەڕبوونیشـیان لە گەروویەوە یەکسـانن! جیـاوازیی

نێوانیان - بۆ مرۆڤی بێئاگای نەزان - تەنها لە چێژێکی کەمخایەنی چەند سانیەییدایە. چونکە هەستی چەشتن هەمیشە بەم جیاوازییە کەمخایەنە ئەو مرۆڤە دەخەڵەتێنێت.

لە ڕاستیدا "هەستی چەشتن" ئەرکی پاسەوانیی لەش و سەرپەرشتیکردنی گەدەی مرۆڤی پێ سپێرراوە، کە ئەمەش کارێکی ئیجابییە، بەڵام گەر واز لەو ئەرکەی ئەستۆی بهێنێت و لە پێناوی دەستەبەرکردنی چێژێکی زیاتر - بۆ مرۆڤی بێئاگا - هەوڵی ڕازیکردنی ئەوی پاسەوان بدرێت، ئەوا کاریگەری و ئەنجامێکی سەلبی بۆ لەشی مرۆڤ بەجێدەهێڵێت.

کەواتە ئەگەر لە بریی یەك قورش دە قورشی بدرێتێ، ئەوا فەرمانبەرییە خاوێنە بێگەردەکەی لێڵ دەبێت و، خۆیشی دەبێت بە شوێنکەوتەی "شەیتان".

لەبەر ئەوە - برام! - توخنی ئەم ڕەفتارە مەکەوە، با گرفتاری چەپەڵترین جۆری ئیسراف نەبیت!

* * *

## "هەستەوەری چەشتن" فەرمانبەری تەلگرافە.. "لەزەت" مەکە بە خواست و ئارەزووی، با لە ڕێ دەرنەچێت![1]

خوای گەورە، بە چاکەی پەروەردگاری و دانایی و چاودێریی خۆی دوو مەڵبەندی لەناو دەم و لووتی مرۆڤدا دامەزراندووە، کە پاسەوانەکانی سەر سنووری جیهانی بچووکی مرۆڤی تێدا داناون و، هەموو ڕەگێکی وەك تەلەفۆنێك داکوتاوە و دەمارەکانیشی لە حوکمی تەلگرافدا داناوە. پاشان چاودێریی بەخشندەیی ئەو، ئەرکی ناردنی گفتوگۆ تەلەفۆنییەکانی بە "هەستی بۆنکردن" و، ناردنی تەلگرافەکانیشی بە "هەستی چەشتن" سپاردووە.

---

(١) ئەم پارچەیە ناوکی پەیامی ئیقتیصادە، دەڵێی ئەو پەیامە لەم چەند دێڕەدا کورت کراوەتەوە! (دانەر)

پاشان میهرەبانیی ڕۆزیدەری ڕاستەقینە، لیستی نرخ و بەهای لەسەر یەك بە یەکی ڕۆزییەکان داناوە، کە بریتین لە تام و ڕەنگ و بۆن.. چونکە ئەم سیانە - لە ڕووی ڕۆزیدانەوە - وەك تابلۆی ئاگاداری و بلیتی دەعوەت و ڕوخسەتنامە وان، بانگی میوان و خولکی هەژاران دەکەن!

ئەو ڕۆزیدەرە بەخشندەیەش چەندین ئەندامی بۆ "چەشتن" و "بینین" و "بۆنکردن" بە زیندەوەرە ڕۆزیدراوەکان بەخشیوە و، ئنجا خواردەمەنییەکانیشی بە چەندەها جۆر ڕەنگ و بۆی ئارایشت و جوانی ڕازاندووەتەوە، تاکو دڵانی موشتاق و تاسەمەندیان پێ بداتەوە و، شەوق و هەستی کەسانی بێ پەرواشیان پێ بجووڵێنێت..

ئنجا هەر ئەوەندەی خۆراك دەگاتە ناو دەم، یەکسەر هەستەوەری چەشتن (بە تەلگراف) سەرجەمی ئەندامەکانی لەش ئاگادار دەکاتەوە و، هەستەوەری بۆنکردنیش (بە تەلەفۆن) جۆر و بابەتی خواردنەکەیان پێ ڕادەگەیەنێت!

گشت زیندەوەران، کە ڕۆزی و پێداویستییان لە یەکتر جیاوازە، تێکڕا بەپێی ئەم هەواڵانەی کە بۆیان دێت ڕەفتار دەکەن. جا یان ئەوەیە پێشوازی لەو ڕۆزی و خواردنە دەکەن، یاخود وەڵام دێتەوە بە ڕێ پێ نەدانی. ئەو کاتە "دەم" خواردنەکە دەهاوێتە دەر، تەنانەت هەندێ جار تفیش لە چارەی دەکات!

جا مادەم "هەستی چەشتن" فەرمانبەرە و لە لایەن چاودێریی خوای گەورەوە کاری پێ سپێرراوە، ئەوا هەرگیز بە تامچەشتنی هەمیشە بەردەوام مەیخەڵەتێنە و لە ڕێ دەری مەکە، دەنا لەبەر ئیشتیهای درۆینە کە سەرنجی ڕادەکێشێت، ئیشتیهای ڕاستەقینەی لەبیر دەچێتەوە. ئنجا مرۆڤ، لەسەر ئەو هەڵەیەی، بە نەخۆشی سزا دەدرێت و بە دەرد و بیماری تۆڵەی لێ دەسێنرێتەوە.

بزانە کە: تام و لەزەتی ڕاستەقینە لە ئیشتیهای ڕاستەقینەوە سەرچاوە دەگرێت.. ئیشتیهای ڕاستەقینەش لە پێویستیی ڕاستەقینەوە هەڵدەقوڵێت.

ئا لەم چێژ و لەزەتە ڕاستەقینەیەدا - کە سەروزیادی مرۆڤە - پادشا و گەدا یەکسانن!

* * *

## جۆری ڕوانین وەك "نییەت" وایە، عادەت دەکات بە عیبادەت!

بە وردی سەرنج لەم خاڵە بدە:

هەروەك عادەتە حەڵاڵەکان لە ڕێی نییەتەوە دەبن بە عیبادەت، زانستە گەردوونییەکانیش بە هەمان شێوەن؛ "جۆری ڕوانین" دەیانکات بە زانستی خواناسی!

ئەوەتا گەر لەگەڵ سەرنجدانی ورد و بیرکردنەوەی قووڵدا لە سنعەت و وردەکارییەکان، بە "تێڕوانینی حەرفی" تەماشای ئەو زانستانە بکەیت، واتە بڵێیت: (بەدیهێنانی ئەمە چەندە ناوازەیە و بەدیهێنەری مەزن چەندە جوان بەدیی هێناوە)، نەك بڵێیت: (چەندە جوانە)..

بەڵێ، گەر لەم گۆشەیەوە بۆ گەردوون بڕوانیت، ئەوا نەخشونیگارەکانی نیگارکێشی مەزن و، بریسکانەوەی ویست و وردەکاری لە ڕێسا و دانایی ئەودا، سەرجەمی گومانەکانت دەدەن بە بادا و ڕووناکییان لە جێدا بەجێدەهێڵن. ئەو کاتەش زانستە گەردوونییەکان دەبن بە زانیاریی خواناسین.

بەڵام گەر بە "واتای ئیسمی" و لە گۆشەی "سروشت"ەوە بڕوانیتە گەردوون، واتە پێت وابێت گەردوون لە خۆیەوە پەیدا بووە، ئەوا بازنەی زانیارییەکان سەبارەت بە تۆوە دەبن بە مەیدانی نەزانی.

ئنجا بزانە کە چۆن ڕاستییە بەرزەکان لەناو دەستە نزمەکاندا بە زایە دەچن!

گەلێ نموونەی تر هەن شایەتن لەسەر ئەم ڕاستییە.

* * *

## لەم جۆرە سەردەم و ڕۆژگارانەدا "شەرع" بوار بە هەڵبژاردنی ژیانی "ڕەفاهییەت" نادات

هەرکاتێك تام و لەزەتەکان بانگیان لە مرۆڤ کرد، دەبێ بە: "وا بزانە خواردم" وەڵام بدرێنەوە! چونکە ئەو کەسەی ئەمەی کرد بە دەستووری ژیانی، مزگەوتێکی نەخوارد کە دەیتوانی بیخواردایە[1]!

لە سەردەمەکانی پێشیندا زۆربەی موسڵمانان برسی و دەستکورت نەبوون، بۆیە - تا ڕادەیەك - دروست بوو موسڵمان ژیانی خۆشگوزەرانی بۆ خۆی هەڵبژێرێت.. بەڵام لەم سەردەمەی ئێستادا زۆربەیان شەو بە برسێتی ڕۆژ دەکەنەوە، بۆیە هیچ بوار و ڕوخسەتێکی شەرعیمان بۆ نەماوەتەوە کە بە دوای لەزەتچەشتندا بگەڕێین. ئەوەتا گوزەرانی زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانان سادە و ساکارە، دەبێ موسڵمانانی تریش لە خواردنی خواردەمەنیی سادەی سەروزیاد(كَفاف)دا چاو لەوان بکەن.

بەڵێ، ئەمە هەزار جار باشترە لەوەی کە مرۆڤ لە خواردن و گوزەرانیدا چاو لە کەمایەتییەکی هەڵەخەرجی دەستبڵاو بکات و لاسایی هەرزەیی ئەوان بکاتەوە.

* * *

## ڕۆژێك دێت کە "نەبوونی نیعمەت" بە نیعمەت دادەنرێت

هێزی یادخەرەوە(قوة الذاكرة) نیعمەتە. بەڵام لە دەمی پەیدابوونی بەڵا و گیروگرفتەکاندا، "لەبیرچوونەوە" بۆ مرۆڤی هەرزە گەلێ باشترە!

---

(١) مزگەوتی: "وا بزانە خواردم "Sanki Yedim لە ئەستەمبوڵ بنیاتنەرەکەی حەزی لە هەر خواردنێك بکردایە، نەیدەخوارد و، بڕی پارەی ئەو شتەی پاشەکەوت دەکرد و دەیوت: "وابزانە خواردم"! تاکو هێندە پارەی کۆکردەوە کە ئەو مزگەوتەی پێ بنیات نا! (دانەر)

لەبیرچوونەوەش، خۆی لە خۆیدا، نیعمەتە، چونکە ئازاری تەنها یەك ڕۆژ دەرخواردی مرۆڤ دەدات و ئازارە کەڵەکەبووەکانی لە بیر دەباتەوە.

* * *

## هەموو گیروگرفتێك لایەنێکی خێری تێدایە

ئەی ئەو کەسەی گیرۆدەی بەڵایەك بووە!

لە ناوەندی هەموو گیروگرفتێکدا نیعمەتێك حەشار دراوە، بە وردی سەرنج بدە با ببینیت.

چونکە هەروەك پلەیەکی گەرمی لە هەموو شتێکدا هەیە، لە هەموو موسیبەتێکیشدا پلەیەکی نیعمەت هەیە.

کەواتە پلەی نیعمەت لەم بەڵا بچووکەدا ببینە و، ئنجا بیر لە گەورەکە بکەرەوە و، شوکری پەروەردگاری میهرەبانی لەسەر پێشکەش بکە.

دەنا هەتا موسیبەت و گیروگرفتەکەت بە گەورە بزانیت، لەبەری دەلەرزیت و لێی هەڵدێیت. چونکە ئەگەر خەمی بۆ بخۆیت، لە بەرچاوتدا بەرە بەرە گەورە دەبێت تا گرفتاری ترس و بیمت دەکات. خۆ ئەگەر دڵەتەپێ و نیگەرانی و گومانیش بخەیتە سەر مەترسی و خەمەکانت، ئەوا (یەك) موسیبەتت لێ دەبێت بە (دە)! چونکە وێنە وەهمییەکەی لەناو دڵدا دەبێت بە ڕوخساری ڕاستەقینە و، ئنجا گورزە جەرگبڕەکانی لەوێ ئاراستەی "دڵ" دەکات.

* * *

## خۆت بە گەورە پیشان مەدە، با بچووك نەبیتەوە!

ئەی ئەو کەسەی "أنـا"یەکی دوو چەندانەی تێدایە و گرفتاری خۆبەگەورەزانین و لەخۆباییبوون بووە!

پێویستە شارەزای ئەم پێوەرە ببیت:

هەموو کەسێك پەنجەرەیەکی هەیە، چ بۆ سەیرکردن و چ بۆ خۆپیشـاندان؛ لێیەوە دەڕوانێتە کۆمەڵ. ئەو پەنجەرەیەش پێی دەوترێت: "پلە و پایە"..

جا ئەگەر ئەو پەنجەرەیە لە باڵای نرخ و بەهای خۆی بەرزتـر بـوو، ئەوا بە "تەکەببور" باڵای نرخ و بەهـای خـۆی درێـژ دەکـات، تـاکو لەو پەنـجەرەیەوە دەربکەوێت..

بەڵام گەر پەنــجەرەکەی لە بــاڵای هــیممەتی ئەو نــزمتر بــوو، ئەوا بە "تەوازوع"ەوە خۆی بچووك دەکاتەوە و دادەنەوێت تـا لەو ئاسـتەدا دەبینێـت و دەشبینرێت!

پێوەری مەزنایەتی لە مرۆڤانی کامڵدا تەوازوعە..

بەڵام کەسانی بوودەڵە و ناتەواو، پێوەری بچووکییان تەکەببورە!

* * *

### بە گوێرەی گۆڕین و جیاوازیی ڕێ و شوێن ڕەوشتەکانیش دەگۆڕێن

تەنها یەك ڕەوشت کە لەسەر یەك شێوە بێت، لە چەنـد جێـیەکی جیاجیـادا جۆراوجۆر دەردەکەوێت. ئەوەتا تاوێ بە دێوێکی ناشیرین و تاوێکی تـریش بە مەلائیکەتێکی ڕۆحسـووك دەبینرێـت و، جـارێ بـاش و جـارێکی تـر خـراپ دەنوێنێت!

ئەمانەی خوارەوە نموونەی ڕوونکردنەوەن:

ئەو دەروون بەرزی(عزة النفس)یەی کە "لاواز" بەرامبەر "بەهێزان" هەسـتی پـێ دەکـات، گەر لە مرۆڤـی بەهێـزدا بێـت بە "تەکەببـور" و "لەخۆبـاییبوون" دادەنرێــت.. هەروەهــا ئەو "تەوازوع"ەش کە مرۆڤــی بەهێــز بەرامــبەر لاواز هەستی پێ دەکات گەر لە بابای لاوازدا بێت بە "زەلیلی" دادەنرێت.

جیدییەت و لێبڕانی کاربەدەست و حوکمڕان لە ڕێ و شوێنی کارەکەیدا بە "ویقار"و، نەرمونیانیشی لەوێدا بە "زەلیلی" لە قەڵەم دەدرێت..

بەڵام ئەگەر ئەم جیدییەتە لە ماڵەوەدا دەربڕێت، ئەوا دەبێت بە بەڵگەی "تەکەببور" و، گەر نەرمونیانیش بێت بەڵگەی "تەوازوع"ە.

ئەگەر مرۆڤ لەو کەسانە خۆش ببێت کە خراپەیان بەرامبەر کردووە، یان چیی هەیە ببیەخشێت و بەختی بکات، کردەوەیەکی چاکی ئەنجام داوە..

بەڵام ئەگەر ئەمە بە ناوی کۆمەڵ و کەسانی ترەوە بکات، ئەوا بە خیانەت دادەنرێت.

سپاردنی تەرتیبدانی پێشەکیی هەر کارێك بە خوای گەورە، بە "تەمبەڵی" دادەنرێت..

بەڵام بۆ هاتنەدیی ئەنجام بە "تەوەککول" دەژمێررێت و شەرع فەرمانی پێ دەدات.

ڕازیبوونی مرۆڤ لە ئەنجامی کرد و کۆششەکانی و ئەو بەشەی دەیدرێتێ و دەیکەوێت "قەناعەت"ە و، کارێکی باشە و، ئارەزووی بەردەوامبوونی هەوڵ و کۆششی تێدا بەهێز دەکات.. بەڵام ڕازیبوون تەنها بەوەی کە لە دەستدایە قەناعەتێکی خراپە، بەڵکو کورتهێنانە لە هیممەتدا!

گەلێ نموونە لەسەر ئەمە هەیە.

قورئانی پیرۆز بە چەشنێکی ڕەها ناوی "الصالحات" و "التقوی" دەبات. ئەم دەستنیشان نەکردنەشیان لە لایەن قورئانەوە هێمایە بۆ کاریگەریی مەقام و مەنزڵ و پلە و پایەکان.

کەواتە پوختە و کورتەیەکی قورئانی پیرۆز درێژەپێدانە و.. بێدەنگیشی گوفتارێکی بەرفراوانە!

* * *

## حەق سەردەکەوێت (الحَقُّ يَعْلُو)

برادەر!

ڕۆژێکیان یەکێك پێی وتم:

(مادەم "الحَقُّ يَعْلُو"[١] وتەیەکی ڕاستە و هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نییە، ئیتر بۆچی کافر بەسەر موسڵماندا سەردەکەوێت و، "هێزیش" بەسەر "حەقـدا" زاڵ دەبێت)؟

منیش لە وەڵامدا وتم:

سەرنج لەم چوار خاڵەی خوارەوە بدە، ئەو گرێکوێرەیە دەکرێتەوە:

● **خاڵی یەکەم:**

مەرج نیـیە هەمـوو هۆکارەکـانی حەق، حەق بـن. هەروەك مەرج نیـیە کە هەموو هۆکارەکانی ناحەق وەك خۆی ناحەق و ناڕەوابن.

کەواتە ئەنجامەکە بەم جۆرە دەبێت کە:

هەر هۆکـارێکی حەق (بـا بە لای ناحەقیشـەوە بێـت) بەسـەر هۆکـارێکی ناحەقدا (با لە پەنای حەقیشدا بێت) سەردەکەوێت!

ئەم ئەنجامە ئەوە دەگەیەنێت کە:

حەق بە بۆنەی هۆ ناڕەواکەیەتی وا ژێر ناحەق دەکەوێت!

واتە ژێرکەوتنەکەی شـتێکی کـاتییە و، خـۆیی و هەمیشـەیی نیـیە. چـونکە ئەنجامی هەموو کارێك هەمیشە بۆ حەق و ڕەوایە.

---

(١) شـێخ ئیسـماعیلی عەجلـوونی لە کتێبـی "کشـف الخفـاء"دا بەم جـۆرە ڕیـوایەتی ئەم فەرموودەیە دەکات: "الإسلام يعلو ولا يُعلى". پاشان دەڵێت: "رواه الدارقطني والروياني عن عائذ بن عمرو المـزني رفعـه، والطـبراني والبيهقـي عـن معـاذ رفعـه، وعلقـه البخـاري في صحيحه. والمشهور على الألسنة زيادة: (عليه) آخراً، بل هي رواية أحمد. والمشـهور أيضـاً على الألسنة: (الحق يعلو ولا يُعلى عليه)..." إهـ. بڕوانە: "كشف الخفـاء ومزيـل الإلبـاس" تأليف الشيخ اسماعيل بن محمد العجلوني ، ج١ ص١٢٧ الحديث رقم٣٦٢. (وەرگێڕ)

بەڵام کە "هێز" سەردەکەوێت، هی ئەوەیە کە بەشێکی لە "حەق" تێدایە و، نهێنییەکی سەرکەوتنی تێدا شارراوەتەوە.

● **خاڵی دووهەم:**

لە کاتێکدا کە دەبێت هەموو ڕەوشتەکانی مرۆڤی موسڵمان وەك خۆی موسڵمان بن، کەچی دەبینین لە واقیعدا وا نییە، ئەگەر وایش بێت هەمیشەیی نییە.

کەواتە، هەر بەم جۆرەش، پێویست نییە هەموو سیفەت و ڕەوشتەکانی مرۆڤی کافر، وەك خۆی کافر بن..

بە هەمان شێوەش لە سیفەت و ڕەوشتی مرۆڤی فاسقدا، مەرج نییە هەموویان فاسق بن و لە فاسقییەکەیەوە پەیدا بووبن..

کەواتە سیفەتێکی موسڵمانانە کە لە کافرێکدا بێت، بەسەر سیفەتێکی ناموسڵمانانە و نامەشرووعی موسڵمانێکدا سەردەکەوێت. ئیتر بەم "هۆ" حەقەوە ئەو کافرە بەسەر ئەو موسڵمانەدا (کە سیفەتێکی نامەشرووعی تێدایە) سەردەکەوێت.

پاشان دەبێ ئەوەش بزانین کە مافی ژیان لەم دنیایەدا مافێکی گشتییە بۆ هەمووان. کەواتە کافرێتی ڕێگا لە مافی ژیان ناگرێت، ئەو ژیانەی کە درەوشانەوەی بەزەییە گشتییەکەی خوای گەورەیە و، نهێنیی حیکمەتی بەدیهێنانی تێدایە.

● **خاڵی سێهەم:**

خوای گەورە بە دوو جۆر خۆی لە بوونەوەران دەردەخات و بەسەریاندا دەدرەوشێتەوە. ئەم دەرکەوتنانەش بریتین لە دوو دەرکەوتنی شەرعی و، لە دوو سیفەتی کەماڵی خوای گەورە خۆیەوە پەیدا بوون:

***یەکەمیان:***

شەرعی تەکوینی (یان سونتەتی کەونی) کە بریتییە لە ویست و تەقدیری خوای گەورە و، لە سیفەتی: "الإرادة"وە پەیدا بووە.

***دووهەمیان:***

ئەو شەرعە زانراوەیە، کە لە سیفەتی: "الکلام"ەوە پەیدا بووە.

جا هەروەك لە لایەن مرۆڤەوە گوێڕایەڵی و سەرپێچی (هەردووکیان) بەرامبەر بە فەرمانە شەرعییەکان ڕوو دەدەن، بە هەمان جۆر، گوێڕایەڵی و سەرپێچیش بەرامبەر فەرمانە تەکوینییەکان (واتە سونتەتە کەونی و ژیانییەکان) ڕوو دەدەن.

زۆربەی جاریش یەکەمیان، کە گوێڕایەڵان و سەرپێچیکارانی فەرمانە شەرعییەکانن، پاداشت و تۆڵەی خۆیان لەودنیادا وەردەگرن..

بەڵام زۆربەی جار دووهەمیان، کە گوێڕایەڵان و سەرپێچیکارانی سونتەتە کەونی و ژیانییەکانن، هەر لەم دنیایەدا بە پاداشت و تۆڵەی خۆیان دەگەن!

جا هەروەك پاداشتی ئارامگرتن؛ سەرکەوتنە..

هەروەك تۆڵەی تەمبەڵی و دانیشتن؛ زەلیلی و سەرشۆڕییە..

هەروەك ئەنجامی ژەهر؛ نەخۆشییە و، هی دەرمان؛ شیفا و چاکبوونەوەیە..

بە هەمان جۆر، پاداشتی کۆشش؛ دەستکەوت و دەوڵەمەندییە و.. پاداشتی بەردەوامبوونیش لەسەر حەق؛ سەرکەوتنە.

جاری وا دەبێ کە فەرمانەکانی ئەم دوو شەریعەتە پێکەوە لە شتێکدا کۆ دەبنەوە.. ئیتر هەریەکەیان لایەنێکی هەیە.

کەواتە گوێڕایەڵیی فەرمانێکی تەکوینی، کە ئەم گوێڕایەڵییە شتێکی حەقە (چونکە گوێڕایەڵییە بۆ فەرمانێکی خوا) بەسەر مل بۆنەدان و سەرپێچیکردنی هەمان فەرمانی تەکوینیدا سەردەکەوێت، چونکە سەرپێچیکردن لە هەر فەرمانێکی تەکوینی دەچێتە ڕیزی ناحەقەوە و دەبێتە بەشێك لەو ناحەقە.

جا لە هەرکاتێکدا هەر حەقێك بوو بە هۆ بۆ هەر ناحەقێك، ئەوا بە بێ هیچ گومانێك بەسەر ئەو ناحەقەدا سەردەکەوێت کە بووە بە هۆ بۆ حەقێك. پاشـان ئەنجامیش بەو جۆرە دەبێت کە دەبینیت حەق ژێر ناحەق دەکەوێت. بەڵام نەك خۆی بەڵکو هۆکارەکەی.

کەواتە مەبەست لە (حەق سەردەکەوێت - الحَقُّ يَعْلُو)دا ئەوەیە کە خـودی حەق خـۆی لە خۆیـدا سـەرکەوتووە و هەر سەریشـدەکەوێت. لە ڕاسـتیدا ئەنجامی دواڕۆژ لەم وتەیەدا مەبەستە. واتە سەرکەوتن تەنها لەم دنیـایەدا نیـیە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە خۆپەیوەستکردن بە هەموو لایەنەکانی حەقەوە، شـتێکی مەبەست و پێویستە.

● **خاڵی چوارەم:**

ئەگەر هات و حەقێـك لە پـلەی "هێـز"دا مـایەوە، واتە نەچووبـووە پـلەی "واقیع و فیعل".. یان لەگەڵ شتێکی تردا ئاوێتە بووبـوو.. یـان خڵـتە و غەشی تێدا بوو، بەم بـۆنەیەوە پێویسـتی بەوە دەکـرد کە حەق دەربخرێـت و هێـزێکی نوێی پێ بدرێت و لەو خڵتانە پاك بکرێتەوە، ئەوا بۆ ئەم مەبەستە بە شـێوەیەکی کاتی ناحەقی بەسەردا زاڵ دەکرێت، تاکو لە ئەنجـامی زۆرانکـاری و پاڵنانـدا، حەق لە هەموو چڵك و چەپەڵییەك پـاك ببێـتەوە و، نرخـی "دراو"ی حەق، کە تابلێی بەنرخە، دەربکەوێت.

خۆ ئەگەر هات و ناحەق لە کات و شـوێنێکی دیـاریکراوی دنیـادا بەسـەر حەقـدا سـەرکەوت، ئەوا تەنهـا یەك لایەنی جەنـگەکەی بـردووەتەوە نەك هەمووی. چونکە ئەنجامی ﴿وَالْعَاقِبَـةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (الأعـراف:١٢٨) واتە ئەنجام و دواڕۆژ بۆ خواپەرستانە، ئەنجامێکە حەقی بۆ لا دەگەڕێتەوە و پێی دەگات.

هەر بەم چەشنەیش ناحەق - تەنـانەت لە کـاتی سـەرکەوتنی ڕواڵەتیشـدا - هەمیشە هەر ژێرکەوتووە و، لە وتەی "الحَقُّ يَعْلُـو"دا نهێنییـەکی قـووڵ هەیە کە

پاڵ بە ناحەقەوە دەنێت و بە زۆر بەرەو سزای دواڕۆژی دنیا و قیامەتی دەبات. واتە "الحَقُّ يَعْلُو" بەرەو دواڕۆژ و ئەنجام دەڕوانێت.

بەم چەشنە زانیمان کە حەق - با لە ڕواڵەتیشدا ژێرکەوتبێت - هەمیشە هەر سەرکەوتووە.

* * *

## چەند دەستوورێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا

ئەگەر دەتەوێت شارەزای چەند دەستوورێکی سەبارەت بە کۆمەڵ ببیت، ئەوا بزانە کە:

هەر دادگەرییەك "یەکسانی"ی تێدا نەبێت، هەرگیز بە دادگەری دانانرێت.

"لەیەکچوون" هۆکارێکی گرنگە بۆ "دژایەتی"!

بەڵام پێکەوەگونجان (التناسب) بناغەی پشتگیریی یەکترییە.

سەرچاوەی "تەکەببور" بچووکیی دەروونە!

سەرچاوەی لەخۆباییبوونیش لاوازیی دڵە.

"دەستەوسانی"ش بووە بە مایەی سەرهەڵدانی ناکۆکیی نێوان خەڵکی.

بەڵام حەزکردن لە شارەزایی مامۆستای زانستە.

"پێویستی" سەرچاوەی "داهێنان"ە.

"بیربچووکی" و "دەروون تەسکی"ش مامۆستای هەرزەییە.

وا ئێستا ئەم بیربچووکی و دەروون تەسکییەی کە خۆی لە نائومێدی و گومانخراپییەوە سەرچاوە دەگرێت، بووە بە سەرچاوەی "هەرزەیی"!

"گومڕایی" لە بیردایە.

"تاریکی"ش سەرانسەری دڵ دەگرێتەوە.

"ئیسراف"یش لە کاروباری سەر بە جەستەدا دەبێت.

* * *

## ئافرەتان بە دەرچوونیان لە ماڵ مرۆڤایەتییان لە ڕێ دەرکردووە، چار نییە دەبێ بڕۆنەوە ناو ماڵ!

(إذا تأنَّثَ الرِّجالُ السُّفهاءُ بالهَوَسَات، إذاً تَرَجَّلَ النِّسَاءُ الناشِزاتُ بالوَقاحَات)[1]!

واتە: (گەر پیاوە هەرزەکان، بە شوێنکەوتنی هەوا و هەوەسبازی، خووی ئافرەتیان گرت، ئەوا ئافرەتانی سەرسەخت و ملنەدەریش، بە ڕەفتاری چەپەڵ، خووی پیاوانی نالەبار دەگرن).

* "شارستانێتیی هەرزە و نەفام" ئافرەتانی لە ماڵەکانی خۆیان دەرهێناوە و، سووکایەتیی بە ڕێز و حورمەتی ئەوان کردووە و، بە وێنەی کەرەسەیەکی سوود لێ وەرگرتنی مفتە بەکاری هێناون.

کەچی"شەرعی ئیسلام "بەزەیی بە ئافرەتدا دێتەوە، بۆیە بانگیان دەکات کە بۆ ماڵەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. چونکە ڕێزی ئەوان بەندە بە مانەوەیان لە ماڵەکانیاندا و، حەوانەوەیان لە توێی ماڵەکانیاندایە و، ژیانیشیان پابەندی بەردەوامیی خێزانەکانیانە.

ئەوەتا:

ئارایشتی ئەوان؛ خاوێنییانە و..

سام و هەیبەتیان؛ لە ڕەوشتجوانییاندایە و..

جوانییان؛ داوێنپاکییانە و..

کەماڵیان؛ شەفەقەتەکەیانە و..

---

(١) ئەم پارچەیە بناغەی ئەو "پەیامی حیجاب"ەیە کە دادگا بۆ مەبەستی تاوانبارکردنی دانەرەکەی پێش چاوی خست، بەڵام لە ڕاستیدا دادگا و حاکمەکانی ئەوی تا ئەبەد پێ ئیدانە و تاوانبار کرا و، بە بەڵگە هەموویانی بەستەوە و دەمکوتی کردن. (دانەر)

گەمە و گاڵتەشیان؛ منالەکانیانە.

خۆ ئەگەر ویستێکی ئاسنین نەبێت، ئافرەت ناتوانێت لە بەرامبەر ئەو هۆکارە تێکدەرانەوە خۆی ڕابگرێت کە لەم سەردەمەدا ڕوو بەڕوویان دەکرێتەوە.

* هەر کوڕێك کە "برایەتی" بەسەر ئەندامانیدا زاڵ بێت، گەر ئافرەتێکی جوانیان بڕواتە ناو، یەکسەر دەماری ڕیا و مونافەسە و حەسوودی و خۆپەرستییان تێدا دەورووژێنێت و، هەوا و ئارەزووە نوستووەکانیش بە خەبەر دێنێت!

خۆدەرخستنی بێ سنوور و بێ بەربەستی ئافرەت، هۆکارێکە بۆ دەرکەوتن و گەشەکردنی ڕەفتارە چەپەڵ و خراپەکانی مرۆڤ!

* ئەم وێنانەی کە چەند تەرمێکی بچووك و مردووی خەندەلێون، ڕۆڵێکی گەلێ ترسناکیان لە گیانی گەلحۆ و نەفامی مرۆڤی هاوچەرخدا گرتووەتە ئەستۆ، بگرە دارای کاریگەرییەکی گەلێ سامناکن[1].

* ئەو پەیکەرانەی کە لە شەرعدا قەدەغەن و ئەو وێنانەش کە حەرامی کردوون، یان ستەمێکی بەردبوو.. یان ڕیایەکی بەرجەستە.. یاخود هەوا و ئارەزوویەکی بەستووی چەشنی شەختە سەهۆڵن.. یان تەلیسمێکن ڕۆحە چەپەڵەکان ڕادەکێشن!

* * *

(١) هەروەك ئەگەر مرۆڤ بە نەزەری ئارەزوو بۆ تەرمی هەر ئافرەتێك بڕوانێت، بەڵگەی سووکی و نزمایەتیی دەروونیەتی.. بە هەمان جۆر سەیرکردنی وێنەی ئافرەتێکی جوانی مردوو بە ویستی ئارەزوو - لە کاتێکدا کە ئەو موحتاجی بەزەییە - هەست و شعوورە بەرزەکانی گیانی مرۆڤ دەسڕێتەوە. (دانەر)

## فراوانیی بواری هەڵسوکەوتی "توانست" دەست بە ڕووی هۆکارەکانەوە دەنێت!

لە بەرامبەر "توانست"ی خواوەندی بەتوانای شکۆمەند و، فراوانیی کاریگەریی ئەو توانستەوە، ئەم "خۆر"ەی خۆمان وەك گەردیلەیەکی لێ دێت!

ڕووبەری هەڵسوکەوتی مەزنی ئەو خاوەن توانستە تەنها لەناو یەك "جۆر"دا تابلۆیی فراوانە.

فەرموو هێزی کێشکەر(القوة الجاذبة)ی نێوان دوو گەردیلە بهێنە و.. لە نزیك ئەو هێزی کێشکردنەوە ڕابگرە کە لە "خۆری خۆران" یان "ڕێی کاکێشان"دایە..

هەروەها ئەو مەلائیکەتەی کە دەنکی تەرزە هەڵدەگرێت، لەگەڵ ئەو مەلائیکەتەدا بهێنە کە وەك خۆر وایە و خۆر هەڵدەگرێت..

بچووکترین ماسیی بە ئەندازەی دەرزییەك لە تەنیشتی نەهەنگێکی مەزنەوە دابنێ.

ئنجا بیر لە درەوشانەوەی فراوانی توانستی بەتوانای شکۆمەند بکەرەوە و، سەرنج لەو وردەکارییە تەواوە بدە کە لە بچووکترین و گەورەترین شتدا هەیە، ئەو کاتە تێدەگەیت کە:

. چ "جازیبییەت" و چ هەر کام لە یاساکانی تر، تێکڕا چەند هۆکارێکی بەخوڕ و چەند فەرمانێکی عورفی و چەند ناو و ناونیشانێکن بۆ درەوشانەوەی توانست و هەڵسوکەوتی دانستی خوای گەورە.

جگە لەمە هیچ شتێکی تر تەفسیر و لێکدانەوەی ڕاستەقینەی ئەو دیاردانە نییە.

هەموو ئەمانە پێکەوە بیریان لێ بکەرەوە، ئەو کاتە بە زەروورەت و بەداهەت دەزانیت کە:

هۆكارە ڕاستەقینە و هۆ یارمەتیدەر و تەنانەت هاوبەشەكانیش چەند شتێكی بەتاڵن و لە چاو ئەو توانستە شكۆدارەدا ئەندێشەیەكی مەحاڵن!

كەماڵی وجوود "ژیان"ە.. هەر لەبەر مەزنی و شكۆداریی پلە و پایەی ژیانە كە دەڵێم: (بۆچی گۆی زەویمان و جیهانەكەمان بە وێنەی زیندەوەری خاوەن ژیان گوێڕایەڵ و ملكەچ نەبێت)؟

خۆ خوای گەورە گەلێ زیندەوەری هاوچەشنی ئەمەی هەیە كە لەناو بۆشایی ئاسماندا دەفڕن و بڵاو بوونەتەوە و جوانی و قەشەنگی و مەزنایەتی و سام و شكۆ بەناو ئاسماندا پەخش دەكەن و خوای گەورەش بە ناو باخ و بێستانی بەدیهاتووانیدا بەڕێوەیان دەبات و دەیانخاتە گەڕ.

ئەو ئاوازانەی كە ئەو بوونەوەرانە دەریاندەكەن و ئەو جموجووڵانەش كە ئەم باڵندانە ئەنجامیان دەدەن، لە ڕاستیدا، بریتین لە تەسبیحات و پەرستن بەرامبەر بەو خواوەندە ئەزەلییەی كە هەر بووە و ئەو دانایەی كە هەر هەیە.

گۆی زەویمان زۆر لە زیندەوەر دەچێت، چونكە ئاسەواری ژیان دەردەخات. خۆ ئەگەر بە فەرزی مەحاڵ گۆی زەوی تا ڕادەی هێلكەیەك بچووك ببوایەتەوە، ئەوا زیندەوەرێكی ناسكۆڵەی لێ دەردەچوو. یان ئەگەر زیندەوەرێكی میكرۆسكۆبیی خڕ بە قەدەر گۆی زەوی گەورە ببێت ئەوا بە وێنەی زەوی دەردەكەوێت.

هەروەها گەر ئەم جیهانەمان بە ئەندازەی مرۆڤ بچووك ببوایەتەوە و ئەستێرەكانیشی وەكو گەردیلەیان لێ بهاتایە، ئەوا دوور نییە زیندەوەرێكی خاوەن هەست و شعوور دەربچوایە. ئەوەتا ژیریی مرۆڤ بوار بەم گریمانە دەدات.

كەواتە جیهان، بە هەموو سووچ و گۆشەكانیەوە، بەندەیەكی تەسبیحاتگوزارە و هەموو گۆشەیەكیشی ملكەچ و گوێڕایەڵی بەدیهێنەری بەتوانای ئەزەلییە.

مەرج نیــیە هەر شــتێك لە ڕووی چەنــدایەتیــیەوە گەورە بێــت لە ڕووی جۆریشەوە هەر بە گەورە دابنرێت، بەڵکو ئەو ســەعاتە بچـووکەی کە هێنـدەی تـۆوە خەرتەلەیەك دەبێـت گەلـێ لەچـاو ئەو ســەعاتە مەزنەی کە بە ئەنـدازەی گەورەیی مزگەوتی ئەیاسۆفیایە، سنعەتی ناوازەتر و توانستی مەزنتر پـێش‌چـاو دەخات..

کەواتە بەدیهێنانی مێش لە بەدیهێنانی فیل گەلێ سەرسووڕهێنەرترە.

خۆ ئەگەر بە قەڵەمی توانســت و مەرەکەبی گەردیلەکـانی ئەثیـر قورئانێـك لەسەر تەنها یەك جوزئی فەرد (واتە لەسەر تەنها یەك بەشی هەرە بچووکی هەر بوونەوەر و پێکهاتوویەك) بنووسرێت، ئەوا وردەکاریی سنعەت لە لاپەڕەکانیدا یەکسان دەبێت لەگەڵ ئەو قورئانە پیرۆزەی کە بە مەرەکەبی ئەستێرەکان لەســەر لاپەڕەی ئاســماندا نــووسراون! ئەوەتــا هەردووکیــان لە ڕەوانی و ناوازەییــدا یەکسانن!

ســنعەتی ئاشکرای وێنەکێشــی ئەزەلی، بەم کەمــاڵ و جــوانییە، لە هەمــوو جێیەکــــدا بە زۆری هەیە و، ئنجــــا یەکبــــوونی هەرە تەواوی کەمـــــاڵی ئەم سنعەتانەش بە دەنگی زوڵاڵ "تەوحید" ڕادەگەیەنێت.

ئەم گوفتارە ڕوونە بە چاوی پەند و ئامۆژگاری وەربگرە.

* * *

## "مەلائیکەت" سوپایەکن جێبەجێکردنی "یاسای سروشتی"یان خراوەتە ئەستۆ

شەریعەتی خوا دوانە، هەر یەکەیان لە سیفەتێکی خوای گەورەوە هاتووە و، هەردووکیشیان ئاراستەی دوو جۆر مرۆڤ کراون کە جێبەجێ کـردنی ئەو دوو شەریعەتەیان خراوەتە ئەستۆ..

*یەکەمیان:*

شەریعەتی تەکوینییە کە لە سیفەتی "ئیرادە"ی خوای گەورەوە هاتووە و، بریتییە لەو یاسا و ویستە پەروەردگارییەی کە بارودۆخ و جموجووڵە نائیختیارییەکانی جیهان - کە مرۆڤێکی گەورەیە - ڕێکدەخات. هەندێ جاریش بە هەڵە ناوی سروشت(الطبیعة)ی لێ دەنرێت.

*دووهەمیان:*

ئەو شەریعەتەیە کە لە سیفەتی "کەلام"ی خوای گەورەوە هاتووە و کردار و ڕەفتاری ئیختیاریی ئەم مرۆڤە ڕێکدەخات کە جیهانێکی بچووکە.

هەندێ جاریش هەردوو شەریعەتەکە پێکەوە کۆ دەبنەوە.

مەلائیکەتانیش نەتەوەیەکی مەزن و سوپا و سەربازی خوای گەورەن و، هەڵگر و نوێنەر و جێبەجێکاری شەریعەتی یەکەمن.

هەندێکیان بەندەی تەسبیحاتگوزارن و، هەندێکی تریشیان نوقمی عیبادەت و نزیکی عەرشی ئەعزەمن.

* * *

**"مادده" هەتا ناسك و تەنکتر بێت "ژیان"ی تێدا بەهێزتر دەبێت**

"ژیان" ئەسڵ و بناغەی وجوودە.. "مادده"ش شوێنکەوتەی ژیانە و بە ژیانەوە بەندە.

خۆ ئەگەر بەراوردێك لە نێوان پێنج هەستەوەرەکانی مرۆڤ و زیندەوەرێکی میکرۆسکۆبیدا بکەیت، دەبینیت:

مرۆڤ چەندە لەو زیندەوەرە میکرۆسکۆبییە گەورەترە، هەر بەو ڕێژەیەش هەستەکانی لە هی ئەو نزمترە!

واتە ئەو زینـدەوەرە بچـووكە دەنگـی بـراكەی دەبیسـتێت و ڕۆزیـیەكەشی دەبینێت.

خـــۆ ئەگەر بە ئەنـــدازەی مـــرۆڤ گەورە ببـــوایە ئەوا بە ڕادەیەكی سەرســوورهێنەر هەسـت و نەسـتەكانی فـراوان دەبـوو. كەواتە ژیـانەكەی ڕووناكییەكە تیشـك بـڵاو دەكـاتەوە و، بینیـنەكەشی نـوورێكی ئاسـمانیی وەك هەورە برووسكە وایە.

مرۆڤ خۆیشـی زینـدەوەرێكی وەهـا نییە كە لە بارسـتاییەكی "لە مـردوو دروسـتبوو" پێكهاتبێـت.. نەخێـر، بەڵكـو خـانە(حجيرة)یەكی گەورەیە كە لە ملیارەها خانەی زیندوو پێكهاتووە.

(إنَّ الإنسانَ كَصُورةِ "يٰس" كُتِبَتْ فيها سُورةُ "يٰس")!
فتبارَكَ اللّٰهُ أحْسَنُ الْخَالِقِينْ!

* * *

## فەلسەفەی ماددی تاعوونێكی مەعنەوییە

فەلسەفەی ماددی تاعوونێكی مەعنەوییە، چونكە پەتایەكی كوشندەی لەناو گرۆی مرۆڤدا بڵاوكردەوە[1] و گرفتاری غەزەبی خوای گەورەی كردن.

خۆ هەتا بە چـاولێكەری و تەڵقینـداداان توانـا و قـابیلییەتی هەڵـگەڕانەوە و ڕەخنەگرتنیش فراوان بكرێت، ئەو تاعوونەش پتر فراوان دەبێـت و زیـاتر بـڵاو دەبێتەوە.

حەپەسـانی مـرۆڤ لە بەردەم زانسـتەكاندا و ڕۆچـوونی لە چـاولێكەریی شارستانێتیی سەردەمدا، سەربەستی و گیانی ڕەخنە و هەڵـگەڕانەوەی داوەتـێ. ئیتر لە غرووری ئەو مرۆڤەوە "گومڕایی" سەری هەڵدا!

* * *

(١) ئاماژەیە بۆ جەنگی جیهانیی یەكەم. (دانەر)

## "بێکاری" لە بوونەوەردا نییە و، مرۆڤی بێکاریش لەنێو "وجوود"دا بۆ "عەدەم" تێدەکۆشێت

بەدبەختترین و دڵتەنگترین کەس مرۆڤی بێکارە..

چونکە بێکاری "نەبوون"ێکە لە ناوەندی "بوون"دا، واتە مردنە لە نێوان ژیاندا.

بەڵام هەوڵ و کۆشش ژیانی "بوون" و بێداریی "ژیان"ە.

* * *

## "ڕیبا" سەرتاپا زیانە بۆ موسڵمانان

سوو (واتە ڕیبا) دەبێت بەهۆی کارنەکردن و، بڵێسەی شەوقی هەوڵ و کۆشش لە مرۆڤدا دەکوژێنێتەوە.

سوود و قازانجی ئەم بانکانەی کە دەرگا و هۆکاری ڕیبان، تەنها دەگەڕێتەوە بۆ خراپترین و بێکەڵکترینی کەسانی گرۆی مرۆڤ کە کافرانن..

هەروەها بۆ خراپترینی ئەوانیش کە ستەمکارانن..

هەروەها بۆ خراپترینی ئەوانیش کە هەرزەترینیانن!

زیانی ڕیبا بۆ جیهانی ئیسلامی یەکپارچە زیانێکی زەق و ئاشکرایە.

شەرعیش پێی وا نییە کە دەکرێت لە هەموو کاتێکدا ڕەفاهییەتی سەرجەمی گرۆی مرۆڤ بێتەدی، چونکە "کافری حەربی" (ئەوەی لە دۆخی جەنگدایە لەگەڵ موسڵماناندا) ڕێزی لێ ناگیرێت و خوێنەکەشی پارێزراو نییە.

* * *

## قورئانی پیرۆز هەر خۆی بۆ خۆی پارێزگاری لە خۆی دەکات و حوکمی خۆی ئەنجام دەدات[١]

مرۆڤێکم دی گرفتاری نائومێدی و ڕەشبینی بووبوو، دەیوت:

زانایان لەم ڕۆژگارانەدا کەم بوونەتەوە و "چەندایەتی" بەسەر "چۆنێتی"دا زاڵ بووە.. دەترسین ڕۆژێك بێت چرای ئایینەکەمان بکوژێتەوە!

وتم: هەروەك ناگونجێت نووری گەردوون و ئیمانی ئیسلامەتیمان بکوژێتەوە، ئایینی ئیسلامیش هەر دەمێنێتەوە و هەمیشە تیشکی درەخشانی خۆی پەخشان دەکات، بە مەرجێ منارەکانی ئایین.. جێگاکانی خواپەرستی.. مەعالیمی شەرع، کە شەعائیری ئیسلامن و مێخە چەسپاوەکانی ناو ناخی "زەوی"ن، نەکوژێنەوە..

ئەوەتا هەموو پەرستگایەك، کە بۆ پەرستنی خوای گەورە بنیات نراوە، لە خۆیدا بووە بە مامۆستایەك سروشتی خەڵکی فێری خواناسی دەکات..

هەموو مەعالیمێکی شەرعیش بە وێنەی مامۆستایەك و بە زمانی حاڵ و بێ هیچ هەڵە و لەبیرچوونێك، "ئایین" بەگوێی خەڵکدا دەدات.

هەموو یەکێکیش لە شەعائیری ئیسلام، لە خۆیدا، زانایەکی دانایە؛ وانەی ڕۆحی ئیسلام دەڵێتەوە و، بە هاتن و ڕۆشتنی چەرخ و سەردەمەکان ئایینی ئیسلام دەخاتە پێش چاوی خەڵکی.

بە ڕادەیەك دەڵێی ڕۆحی ئیسلام لە شەعائیرەکانیدا بەرجەستە بووە و، ئاوە زوڵاڵەکەشی لە پەرستگاکانیدا وەك سەهۆڵ بەستوویانە و ستوونێکی پشتگیری ئیمانیان پێکهێناوە و، ئەحکامەکانیشی لە مەعالیمەکانیدا بەرجەستە بوون و، پایەکانیشی لە جیهانەکانیدا وەك بەردیان لێ هاتووە و، هەریەك لەو ڕوکنانە

(١) ئەم باسەی کە سی و پێنج ساڵ پێش ئێستا نووسراوە، دەڵێی ئەمساڵ نووسراوە! کەواتە ئاماژەیەکی موستەقبەلییە و بەرەکەتی ڕەمەزان هێنایە گۆڕێ. (دانەر)

ستوونێکی ئەڵماسیی وەهایە کە زەوی بە ئاسمانەوە دەبەستێت. بە تـایبەت ئەم قورئـانە مەزنە وتـارخوێنە خـاوەن ئیعجـازی بەیـانەی کە لە هەمـوو جێـیەکی جیهـانی ئیسـلامدا وتـارێکی ئەزەلی دەدات، بە ڕادەیەك کە هـیچ گۆشـە و شوێنێك نەما گوێی لێ ڕانەگرتبێت، بەڵکو هەمـوان گوێیـان لـێ ڕاگـرت و بە ڕێنمایی هیدایەتی ئەو هەنگاویان نا، تەنانەت لەبەرکـردنی ئەم قورئـانە پیـرۆزە بوو بە پلەیەکی هێندە مەزن کە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە سـیرایەتی تێـدا کـرد کە دەفەرموێ: ﴿وانَّا لَهُ لَحَافِظُوْنَ﴾ (الحجر:٩) و، خوێندنەوەشی بوو بە عیبـادەتی جینێ و پەرستشی گرۆی ئادەمیزاد.

ئەم قورئانە پیرۆزە فێرکـردنی تێـدایە.. یادخسـتنەوەی شـتانی سـەلمێنراوی تێدایە. چونکە شتانی "نەزەری" بە ڕۆشتنی زەمان و بەسەرچوونی کات دەبن بە شتی "بەڵگەنەویست" و "سەلماو"ی ئەوتۆ کە پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکەن.

ئەوەتا ئەو شـتانەی کە پێیان دەوترێت: "ما عُلِمَ مِـنَ الـدِّيْنِ بالضَّـرُورة" لە دۆخـــی نەزەری دەرچـــوون، کەواتە وریـــاکـــردنەوەی خەڵـــکی لێیـــان و یادخستنەوەیان سەروزیادە و، قورئانیش مـادەم وریـاکردنەوە و یادخسـتنەوەی تێدایە ئەوا شیفابەخشی هەموو کات و سەردەمێکە.

ئنجـا بێـداربوونەوە و ڕابـوونی کـۆمەڵایەتیی موسـڵمانانیش گشـت ئەو بەڵگانە بە دەستی یەك بە یەکی موسڵمانان دەسپێرێت کە تایبەتن بە سـەرجەمی موسڵمانانەوە و، تەرازوویان لە هەموو شتێکدا بۆ دادەنێن.

کەواتە ئیمانی هەر کەسێك تەنهـا نەبەسـتراوە بە بەڵـگەی ئەو کەسـەوە و، ویژدانیشی تەنها پاڵی بەو بەڵگەیەوە نەداوەتەوە. بەڵکـو جـگە لەوەش پـاڵی بە چەنـــد بەڵـــگە و هۆکـــارێکی لەژمارەبەدەریشـــەوە داوە کە لە نـــاوجەرگەی کۆمەڵدان.

لە كاتێكدا ڕەفزكردنی مەزهەبێكی لاواز تا ڕۆژگاری بەسەردا تێپەڕ ببێ كارێكی سەخت بێت، دەبێ ئەو ئیسلامە چۆن بێت كە بە درێژایی ئەم هەموو چەرخ و سەردەمانە و بە تەواوەتی باڵی ڕاكێشاوە و دەستەڵاتدار بووە و، پاڵیشی بە دوو بناغەی مەزنەوە داوە كە بریتین لە وەحیی خوای گەورە و، سروشتی ساغی مرۆڤ؟!

بناغە ڕەگداكوتاوەكان و ئاسەوارە ڕوونەكانی ئیسلام لە ناخی نیوەی زەویدا ڕۆچوون و لەگەڵیدا گرێ دراون و وەك ڕۆحێكی سروشتی بە بەر زەویدا كراون. ئیتر چۆن خۆرگیرانێك دەتوانێت ببێت بە پەردە و ئیسلام داپۆشێت، لە كاتێكدا كە هەر ئێستا پەردەی خۆرگیرانی لەسەر لادراوە؟!

بەڵام بە داخەوە هەندێ كافری گەلحۆ و ئەهلی سەفسەتە، هەركات هەلیان بۆ ڕێ بكەوێت، دەیانەوێت خۆیان لە بناغەكانی ئەم كۆشكە بەرز و مەزنە بدەن. بەڵام خەیاڵیان خاوە، هەرگیزاو هەرگیز ئەم بناغانە لەجێی خۆیاندا لەق نابن..

دەبا ئیلحاد لاڵ و بێدەنگ بێت.. ئەو دەویتە ئیفلاسی كردووە و نابوود بووە!

ئایا هێشتا ئەزموونی ناشكوری و كافری و، بەكارهێنانی درۆ و ساختە و بوختان، بەس نییە؟

ئەم زانكۆیە زووتر لە پێشەنگی قەڵاكانی جیهانی ئیسلامەوە بوو لە بەرامبەر كوفر و توغیاندا. بەڵام گوێ پێنەدان و بێئاگایی و دوژمنایەتی - كە سروشتێكی هەژدیهائاسای دژی سروشتە - لە پشتی جەبهەكەوە كەلێنێكی كردەوە و ئیلحاد هێرشی لێوە هێنا و، بیروباوەڕی نەتەوەش لە جێی خۆیدا لەرزەی زۆری پێ كەوت.

دەبێ پێشەنگی ئەو قەڵایانەی کە بە ڕۆحی ئیسلام ڕووناك بوونەتەوە، لە هەموو قەڵاکانی تر سەختتر و لەوانیش وریا و بێدارتر بن. دەبێ ئاوا بێت، دەنا با هەر نەبێت. چونکە نابێ موسڵمانان بخەڵەتێنرێن!

"دڵ" شوێنی جێگیربوونی ئیمانە، بەڵام "مێشك" ئاوێنەیەکە نووری ئیمانی جێگیربووی ناو "دڵ" دەردەخات و، هەندێ جار دەبێت بە موجاهید و، هەندێ جاری تریش پیس و پۆخڵیی گومان و وەهمەکان گسك دەدات.

ئەگەر گومانەکانی ناو "مێشك" نەڕۆنە ناو "دڵ"ەوە ئەوا ئیمانی ناخی مرۆڤ لە شوێنی خۆیدا ناترازێت!

خۆ ئەگەر - وەك هەندێك لەو گومانەدان - جێگای ئیمان "مێشك" بوایە، ئەوا ئیحتیمال و گومانە زۆرەکان - کە هەر لە مێشکدان - دەبوون بە دوژمنێکی سەرسەختی گیانی ئەو ئیمانەی کە "حق الیقین"ە!

دڵ و ویژدان؛ جێگای ئیمانە..

حەدس و ئیلهام؛ بەڵگەی ئیمانە..

هەستێکی شەشەم؛ ڕێگای ئیمانە..

بیر و مێشك؛ پاسەوانی ئیمانە..

* * *

## "پێویستی" پتر داخوازی ئەوەیە کە "موسەللەمات" یاد بخرێنەوە تا ئەوەی "شتانی نەزەری" بوترێنەوە

شتانی زەرووری و موسەللەماتی شەرعی لەناو دڵاندا ڕیشەیان داکوتاوە. خۆ تەنها بێدارکردنەوەیەك بۆ مەبەستی دڵنیابوون و یادخستنەوەیەك بۆ مەبەستی هەست پێ کردن، سەروزیادە و ئامانجیان پێ دێتە دی. وەك

ئاشکرایشە دەستەواژە عەرەبییەکان[1] بە باشترین و بەرزترین شێوە ئەو بێدارکردنەوە و یادخستنەوەیە ئەنجام دەدەن.

کەواتە وتنی وتاری جومعە بە زمانی عەرەبی سەروزیادی ئەوەیە کە خەڵکی بۆ زەروورییات بێدار بکاتەوە و موسەڵلەماتیشیان یاد بخاتەوە، چونکە فێرکردنی شتانی نەزەری ئامانجی وتاری جومعە نییە.

پاشان ئەم دەستەواژە عەرەبییە درووشمی یەکبوونی ئیسلامی لە ناخی ویژدانی موسڵماندا - کە نایەوێت لەت لەت و پارچە پارچە ببێت - بەرجەستە دەکات.

* * *

## حەدیث بە ئایەت دەفەرموێ: پێگەیشتنەوەت مەحاڵە!

گەر بەراورد لە نێوان حەدیث و ئایەتدا بکەیت، بە ئاشکرا بۆت دەردەکەوێت کە ڕەوانترینی ڕەوانبێژانی گرۆی مرۆڤ (کە پێغەمبەری ڕاگەیەنەری سرووشی خواوەندە ﷺ) ناگاتە ئاستی ڕەوانبێژیی ئایەت و، دەزانیت کە حەدیث هەرگیز لە ئایەت ناچێت.

واتە هەر گوفتارێك لە زاری "پێغەمبەرایەتی"یەوە دەربچێت هەمووی قسە و گوفتاری پێغەمبەر ﷺ نییە[2].

* * *

(١) لێرەدا هەستی بە ڕووداوێك كردووە كە دوای دە ساڵ ڕووی دا، ویستی بەرەنگاری بێتەوە و بەری لێ بگرێت*. (دانەر)

(*)مەبەست وتنی سەرانسەری وتاری جومعەیە بە توركی و قەدەغە كردنیەتی بە زمانی عەرەبی، كە لە كۆتایی ساڵەكانی بیستی سەدەی بیستەمدا لە توركیا بە زەبروزەنگەوە پیادە دەكرا). (وەرگێڕ)

(٢) واتە هەندێكی ئایەتی قورئانە و، هەندێكیشیان فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ وەك خۆی لە یەكی جیاكردوونەتەوە. (وەرگێڕ)

## کورتە باسێك لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە

کاتی خۆی لە خەونێکدا خۆم لە ژێر چیای "ئارارات"دا بینی، کتوپڕ لەو خەونەدا چیاکە تەقییەوە و بەردی گەورە گەورەی بە ئەندازەی شاخەکانی بۆ هەموو جێیەکی دنیا هەڵ دا و جیهانی بە تەواوی پەشۆکاند و خستیە لەرزەوە.

کتوپڕ پیاوێك لە تەنیشتمەوە ڕاوەستا و پێی وتم:

چی لە بارەی جۆرەکانی ئیعجازی قورئانەوە دەزانیت بە پوختی و کورتی ڕوونیان بکەرەوە.

هەر هێشتا لە خەونەکەمدا بووم بیرم لە تەعبیرەکەی کردەوە و، وتم:

تەقینەوەی ئەم چیایە نموونەیەکە بۆ ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بەسەر گرۆی ئادەمیزاددا دێن و، بێ هیچ گومانێکیش ڕێنمایی قورئانی پیرۆز بە بەرزی و بڵندی باڵی بەسەر ئەو ئاڵوگۆڕەدا دەکێشێت و، ڕۆژێك دێتە پێش کە ئیعجازی قورئانی تێدا ڕوون دەکرێتەوە.

بۆیە وەڵامی ئەو پیاوەم دایەوە و، وتم:

ئیعجازی قورئان لە حەوت سەرچاوەی هەمەکییەوە دەردەکەوێت و لە حەوت ماك(عنصر) پێکدێت.

❑ **سەرچاوەی یەکەم:**

ڕەوانیی زمانی قورئان لە پاراویی وشەکەیەوە پەیدا دەبێت، چونکە بریسکەی بەیانی "وشە" لە ڕەوانیی هۆنین و، ڕەوانبێژیی مەعنا و، ناوازەیی واتاکان و، بەرزیی ناوەرۆك و، نامۆیی شێوازەکانەوە، سەر هەڵدەدات. ئیتر لە تێکەڵکردنی هەموو ئەمانە و لەناوەندی یەکێك لە جۆرەکانی ئیعجازدا نەخشونیگارێکی ڕەوانبێژیی سەرسووڕهێن و زمانپاراوییەکی ناوازەی ئەوتۆ پەیدا دەبێت کە مرۆڤ هەرگیز لە دووپاتکردنەوەی بێزار نابێت.

❑ ماکی دووهەم:

بـریتییە لە هەواڵـدانە ئاسـمانییەکان سـەبارەت بە ڕاسـتییە پەنهانەکـانی گەردوون و، نهێنییە غەیبییەکانی لە مەڕ حەقیقەتە خواییەکان.

چونکە گەنجینەی زانستی شتانی غەیبی و پەنهان لە کاروبارە غەیبییەکـانی نـاو دووتـوێی "ڕابـوردوو" و، بـارودۆخە شـارراوە نەهاتووەکـانی "داهـاتوو" پێکدێت. جا قورئانی پیرۆز لەم ڕووەوە زمانی"جیهانی غەیـب"ە کە بە هـێما لە بارەی پایەکانی ئیمانەوە لەگەڵ "جیهانی بیـنراو"دا دەدوێـت و، مەبەسـتیشـی لێـرەدا ڕەگەزی مـرۆڤە. خـۆ ئەمەش جـۆرێکە لە بریسـکانەوەیەکی نـوورانیی ئیعجازی قورئان.

❑ سەرچاوەی سێهەم:

بـریتییە لەوەی کە قورئـانی پیـرۆز لە پێـنج لاوە، واتە لە: (وشـە و، واتـا و، ئەحکام و، زانست و، ئامانجەکانیدا) جامیعییەتێکی دەراسای تێدایە.

وشەکەی؛ گەلێ گریمانی فراوان و ڕووی زۆر و زەبەندەی لەخۆ گرتـووە، بە جۆرێك کە هەموو یەکێ لەو ڕووانە بەلای ڕەوانێـژییەوە جـوانە و، زانسـتی زمانی عەرەبیش بەلایەوە پەسەندە و، شایستەی نهێنیی تەشریعیشە.

سـەبارەت بە واتـاکەشی؛ ئەوا ئەو بەیـانە خـاوەن ئیعجـازەی قورئـان سـەرجەمی مەشـرەبەکانی ئەولیـا و چێژەکـانی خواناسـان و ڕێڕەوەکـانی سـالیکان و ڕێگاکـانی زانایـانی کەلام و ڕێبازەکـانی دانایـانی گرتـووەتەوە، تەنانەت هەموویانی لەخۆ گرتووە. ئەوەتا دەلالەتەکـانی دارای شـموولییەتن و واتاکانیشی تابلێیی بەربڵاون.

ئەم مەیدانە گەلێ فراوانە، ئەگەر لەم پەنجەرەیەوە بۆی بڕوانیت!

گشتگیریی ئەحکامەکانی؛ ئەوەتا ئەم شەریعەتە خاوێنە لەو قورئانە پیـرۆزە وەرگیـراوە. چـونکە شـێوازی ڕوونکردنەوەکـانی؛ سـەرجەم دەسـتوورەکانی

بەختەوەریی دنیا و قیامەت و، هۆکارەکانی ئاسایش و دڵنیایی و، پەیوەندیدەرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و، هۆکارەکانی پەروەردە و، حەقیقەتەکانی سەرجەم حاڵەتەکانی، لەخۆ گرتووە.

سەرتاسەریی زانستەکەی؛ زانستە گەردوونییەکان و زانستە خواییەکان، بە چەند پلەیەك و لە ڕێی چەند بەڵگە و هێما و ئاماژەیەکەوە، لە ناو شوورای سوورەتەکانی قورئاندا دانراون.

سەبارەت بە مەبەست و ئامانجەکانیش؛ ئەوا بە هاوسەنگی و، بەردەوامی و، یەکاویەکبوون و، یەکخستنی ئامانج و مەبەستەکان، چاودێرییەکی تەواوی دەستوورەکانی سروشتی کردووە. بەمەش هاوسەنگیی خۆی پاراستووە.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز جامیعییەتی ئاشکرای خۆی لە:

هەمەلایەنگیریی وشە و، فراوانیی واتا و، گشتگیریی ئەحکام و، سەرتاسەریی زانست و، هاوسەنگیی ئامانجەکاندا.. دەرخستووە.

❑ ماکی چوارەم:

بریتییە لەوەی کە بە ئەندازەی پلەی تێگەیشتنی هەموو چەرخێك و، ئاستی ئەدەبی هەموو چینێك و، بە گوێرەی توانا و لێهاتن و پلەی قابیلییاتی یەك بە یەکیان، نوورانێتیی خۆی پەخشاندووە.. ئەوەتا دەرگای قورئان بۆ هەموو چینێکی هەموو چەرخێك لەسەر پشتە، بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەو گوفتارە ڕەحمانییە بۆ هەموو شوێن و کاتێك بە ڕاستەوخۆ و تایبەتی نازڵ بووە!

خۆ تا ڕۆژگاریش پیر ببێت قورئانی پیرۆز زیاتر لاو دەبێتەوە و هێماکانی پتر ئاشکرا دەبن. چونکە ئەو خەتیبە ئیلاهییە - واتە قورئان - پەردەی سروشت و هۆکارەکان دەدڕێنێت و، هەموو کات لە هەموو ئایەتێکدا نووری تەوحید دەتەقێنێتەوە و، ئاڵای شایەتیدانی "تەوحید" لەسەر "غەیب" لەم "جیهانی بینراو"ەدا.. هەڵدەکات.

"بەرزیی گوفتاری قورئان" سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت و داوای تێڕامـان و بیرکردنەوەی لێ دەکـات. چـونکە قورئـانی پیـرۆز زمـانی جیهـانی غەیـبە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ جیهانی بینراودا قسە دەکات.

لەم ماکەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

لاوێتیـی دەراسـای قورئـان گشـتی و هەمەلایەنگیـرە و، هـاوڕازی و هاودەمییەکەشی کـردوویەتی بە خۆشەویسـتی جیننـی و ئـادەمیزاد. ئەمەش لە ڕێی دابەزاندنی شێوازی تێگەیاندنەکانیەوە بـۆ ئاسـتی ژیریـی مـرۆڤ کە پێـی دەوترێـت: "التَّنَـزُّلاتُ الإلٰهِيَـةُ إليٰ عُقُـولِ الْبَشَـرِ" کە بە چەنـد شـێوازێکی جۆراوجۆری قورئان پـێش‌چـاو دەکەوێـت. بـۆ ئەوەی زەینەکـان ڕابهێنێـت و هاودەمی و هاوڕازییان لەگەڵ ئەو ئاستانەدا بۆ فەراهەم بهێنێت.

❑ **سەرچاوەی پێنجەم:**

هەواڵدانەکانی قورئان لە شێوازێکی ناوازەی تۆکمە و پـڕ واتـادان و، خـاڵە سەرەکییەکانی هەواڵە ڕاستەکان وەك شایەتێکی بیـنەری ئامـادەی ڕووداوەکـان دەگێڕێتەوە و، لەم ڕێیەوە مرۆڤیان لێ ئاگادار دەکاتەوە.

ئەو شتانەش کە دەیانگێڕێتەوە بریتین لە:

هەواڵەکـانی پێشـینان و، حاڵەتەکـانی بەرەکـانی ئاینـدە و، نهێنییەکـانی بەهەشـت و دۆزەخ و، ڕاسـتییەکانی جیهـانی غەیـب و، نهێنییەکـانی جیهـانی بینراو و، نهێنییە خواییەکان و، پەیوەندییە گەردوونییەکان..

هەمـوو ئەم هەواڵانەش قورئـانی پیـرۆز بە چـاو دەیانبینێـت ئنجـا ڕایانـدەگەیەنێت، بە ڕادەیەك کە واقیـع و مەنتیـق هەرگیـز ناتوانێـت بەدرۆیـان بخاتەوە و پووچەڵیان بکاتەوە، با خۆیشـی نەتوانێـت هەسـتیان پـێ بکـات و پەییان پێ ببات!

هەر قورئانە کە جێی بڕوای زانای شارەزای کتێبە ئاسمانییەکان بێت، چونکە لەو شتانەدا کە قورئان لەگەڵیاندا یەك دەگرێتەوە، تەسدیقیان دەکات و.. لەوانەشدا کە یەك ناگرنەوە، بۆیان ڕاست دەکاتەوە!

بە ڕاستی ئەمە موعجیزەی ڕۆژگارە، کە ئەم کاروبار و شتە نەقڵییانە لە "نەخوێندەوار"ێکەوە دەربچێت!

❑ ماکی شەشەم:

قورئانی پیرۆز دامەزرێنەر و لەخۆگری ئایینی ئیسلامە. ئەگەر هەموو کات و شوێنێك بپشکنیت، نە لە "ڕابوردوو" نە لە "داهاتوو"دا ئایینێکی وەك ئیسلام نادۆزیتەوە.

قورئانی پیرۆز ئەو ڕاگیرکارە بەتین و بەهێزەیە کە خوای گەورە گۆی زەویی پێ ڕاگیر کردووە، تاکو لە تەوەرە دەرنەچێت و، ڕۆژانە و ساڵانە هەڵی دەسووڕێنێت و دەیخولێنێتەوە و بەڕێوەی دەبات. قورئانی پیرۆز قورسایی و ویقاری خۆی لەسەر گۆی زەویدا داناوە و جڵەوی زەویی بە دەستەوە گرتووە و بواری ملنەدان و بێگوێیی بۆ نەهێشتووەتەوە.

❑ سەرچاوەی حەوتەم:

ئەو شەش نوورەی کە لە ڕێژنەی ئەم شەش سەرچاوەیەوە هەڵقوڵاون، تێکەڵی یەکتری دەبن و تیشکی جوانییەکی ناوازە پەخش دەکەن و حەدسێکی زیهنییان لێ پەیدا دەبێت، کە هۆکارێکی نوورانییە و، لەمەشەوە چێژێك سەرهەڵدەدات کە بە هۆیەوە پەی بە ئیعجاز دەبرێت. ئەو چێژەی کە زمانمان لە ئاستیدا هێندە کۆڵەوارە ناتوانێت دەری ببڕێت و، بیریش هێندە کورتە کە ناتوانێت دەستی بە داوێنی بگات. بەڵێ، ئەو ئەستێرانەی ئاسمان بە چاو دەبینرێن، بەڵام بە دەست ناگیرێن!

قورئانی پیرۆز خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئیعجازە، چونکە وا سیازدە سەدەی ڕەبەقە لە لایەکەوە دوژمنانی قورئان گیانی تەحەددی و بەرەنگاربوونەوەیان

بەرامبەر بە قورئان هەڵگرتووە و، لە لایەکی تریشەوە دۆست و خۆشەویستانی گیانی چاولێکەری و تاسەمەندییان بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی قورئانی پیرۆز تێدا پەیدا بووە. لە ئەنجامی ئەم دوو ئارەزووە توند و بەتینەشەوە ملیۆنەها کتێب بە زمانی عەرەبی نووسراون، گەر ئەو ملیۆنان کتێبە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بەراورد بکرێن ئەوا هەرکەسێك دەیانبینێت یان دەیانبیستێ تەنانەت عەوامترین کەسیش، چ جای مرۆڤی زیرەکی دانا، دەڵێت:

ئەو کتێبانە بەشەرین و ئەم قورئانەش ئاسمانییە!

بێ هیچ گومانێکیش بڕیار دەدات کە هیچ کام لەو کتێبانە لە قورئان ناچن و هەرگیز ناگەنە ئاستی.

جا یان قورئان لە خوار هەموویانەوەیە، کە ئەمەش بە ئاشکرا گریمانێکی مەحاڵ و بەتاڵە، یان گریمانەکەی ترە کە بریتییە لەوەی:

قورئان لە سەرووی هەموویانەوەیە!

لە درێژایی ئەم ماوە زۆرەدا قورئانی پیرۆز دەرگاکانی خۆی بۆ مرۆڤ خستووەتە سەر پشت و ناوەرۆکەکانی خۆیشی پێش چاو خستوون و، گیان و زەینەکانی ئەوانیشی بۆ لای خۆی بانگ کردووە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گرۆی مرۆڤ نەیانتوانی بەرەنگاری قورئان ببنەوە و هەرگیز ناشتوانن. چونکە کاتی تاقیکردنەوە دوایی هات!

قورئانی پیرۆز لەگەڵ کتێبەکانی تردا بەراورد ناکرێت و هەرگیز لەوان ناچێت. چونکە - لەبەر حیکمەتێکی پەروەردگاری - ئەم قورئانە پیرۆزە بەش بەش و جار جار لە ماوەی بیست و ئەوەندە ساڵدا نازڵ بووە و، هەر جارەی چەند هۆکارێکی جیاجیا بۆ نازڵبوونی هاتووەتە کایەوە و، بۆ وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی دووپاتبووی جۆراوجۆر و، بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمی چەندین ڕووداوی جیاجیا و، لە چەند کاتێکی جیاواز و جۆراوجۆر و چەند حاڵەتێکی وەرگرتنی لە یەك نەچوودا و، بۆ تێگەیاندنی چەند قسە بۆکراوێکی

جۆراوجۆر و لە یەکتر دوور و، بـۆ چەنـدەها ئامـانجی ڕێنمایـی یەك لە دوای یەکی جیاجیا.. نازڵ بووە.

وێـڕای ئەم هەمـوو بنـاغە جیـاوازانە و یەکنەبـوونی کاتەکـانی نـازڵبوونی قورئـــان، کەچـــی لە ڕووی ڕەوانبێــژی و وەڵام و گوفتـــارەکانیەوە، کەمـــاڵی ڕەوانی و ڕێــکی و لەگەڵ یەك گونجـــان و پشـــتگیریی یەکتریـــی، لە خۆیـــدا دەرخستووە..

ئەوەتـــا زانســـتی "بەیان"(ڕەوانکـــاری) و "مەعـــانی"(گوزارەکـــاری)ت لەبەردەســـــتدایە، فەرمـــــوو لە چـــاویلکەی ئەم دوانەوە ســــەیری ئەو لایەنە ناوبراوانەی قورئان بکە.

هەروەهـــا قورئـــانی پیـــرۆز "تایبەتکـــاری"یەکی تێـــدایە کە لە هـــیچ قســـە و گوفتارێکی تردا نییە:

چونکە هەر گوفتارێك لە هەر کەسێك ببیستیت ئەوا لەناو ئەو قسەیەدا یان لە پشتییەوە خاوەنەکەی دەبینیت، چونکە شێوازی گوفتار ئاوێنەی مرۆڤە.

دەسا ئەی مرۆڤە پرسیارکەرەکەی جیهانی میسال!

تۆ داوای ڕوونکردنەوەی ئیعجازت لێ کردم، وا منیش ئاماژەم بۆ کرد.

خۆ ئەگەر داوای درێژەپێـدانی بـاسی ئیعجـاز دەکەیـت، ئەوا لە سـنوور و توانای مندا نییە. چونکە ئایا مێش دەتوانێت هەموو ئاسمانەکان ببینێت؟!

کتێبی (ئاماژەکانی ئیعجاز) لەناو چل جۆردا تەنها ڕوونکردنەوەی یەك جۆر ئیعجازی گرتە ئەستۆ، کەچی هێشتا سەد لاپەڕەی ئەو تەفسیرە مافی تەواوی بە ڕوونکردنەوەی یەك جۆری ئیعجاز نەداوە.

لەبەر ئەوە، مـن داوای درێـژەی ڕوونکـردنەوەی "ئیعجـاز"ت لـێ دەکەم، چونکە خوای گەورە ڕێـزی لـێ ناویـت و ڕێـژنەیەکی ئیلهامـاتی ڕۆحیـی پـێ بەخشوویت!

* * *

## کۆتایە دەستی:

## "ئەدەب"ی غەربی هەوەسبازی هەواکاری "دەهاء"دار

## ناگاتە ئاستی:

## "ئەدەب"ی هەر ئەبەدیی قورئانی ڕووناکباری شیفاکاری "هودا"دار!![1]

چونکە ئەو حاڵەتەی کە چێژی بەرز و بڵندی "مرۆڤانی کامڵ" تێر و دڵنیا دەکات، دڵی ئەو چەشنە کەسانە خۆش و شادمان ناکات کە پابەندی هەوا و ئارەزووی منالآنە و هەڵگری خوو و ڕەفتاری هەرزە و نەفامانن!

جا لەسەر بناغەی ئەم "دانایی"یە:

هەر "چێژێك"ی نزم و هەرزە ئاسا، کە لەناو زەلکاوی هەوەسبازی و هەوا و ئارەزووی "دەروون"دا گەشەی کردبێت، بە تامی چێژەکانی "گیان" ئاشنا نییە و بەکامی دڵ حەزیان لێ ناکات!

کەواتە ئەدەبی ئێستاکەی مرۆڤایەتی، کە داچۆڕاوی ئەدەبی ئەورووپایە و، لە دەلاقەی هەلومەرجی "ڕۆمان"ەوە ئەدەب هەڵدەسەنگێنێت، لە بەرامبەر بینینی وردەکارییە نیان و بڵندەکانی قورئاندا کوێر و کۆڵەوارە و.. لە ئاستی چەشتنی ئەو وردەکاری و چێژە بەرزانەشدا بێ توانا و دەستەوسانە. لەبەر ئەوە، هەرگیز ئەو ئەدەبە بیانییە ناتوانێت پێوەرەکانی خۆی بکات بە سەنگی مەحەك بۆ هەڵسەنگاندنی قورئانی پیرۆز!

ئنجا "ئەدەب" لە سێ مەیداندا هەڵدەسووڕێت و لێیان لا نادات:

مەیدانی حەماسەت و جوامێری..

مەیدانی عیشق و جوانی..

مەیدانی وێنەکێشانی واقیع و ڕاستی.

---

(١) بۆ دارشتنەوەی کوردیی ئەم بڕگەیەی ناونیشانی باسەکە، زیاتر دەقە تورکییەکە ڕەچاوکراوە تا وەرگێڕراوە عەرەبییەکە. (وەرگێڕ)

**هەرچی ئەدەبی بیانییە:**

لە مەیدانی "حەماسەت"دا:

عەودالّی "ڕاستی" نییە.. بەڵكو لە ڕێی هەڵنان و پێداهەڵگوتنی ستەم و لە سنووردەرچوونەکانی ستەمکارانەوە، هەردەم شەیدابوونی بەدەستهێنانی "هێز" بە گوێی هەستی مرۆڤدا دەچرپێنێت و، عەودالّی "زاڵبوون" و "بەهێزنازینی" دەکات..

لە مەیدانی "عیشق و جوانی"شدا:

ئاشنای عیشقی حەقیقی نییە.. بەڵكو جێ بۆ چەشتنی چێژی هەوا و ئارەزوویەکی شەهوانیی بە تەوژم لە دەروونەکاندا، دەکاتەوە.

لە مەیدانی "وێنەکێشانی ڕاستی و واقیع"یشدا:

لەو گۆشەیەوە سەیری بوونەوەران ناکات کە دەری بخات ئەو بوونەوەرانە سنعەتی خوای گەورە و بەدیهاتووی میهرەبانیی ئەون. بەڵكو هەموو توانا و بایەخێکی دەترنجێنێتە گۆشەی "سروشت" و وێنەی ڕاستییەکان لەو ڕوانگەیەوە دەکێشێت، بێ ئەوەی بتوانێت خۆی لەو گۆشە نیگایە دەرباز بکات. لەبەر ئەوە، هێندە عیشقی سروشت و بەخوا دانانی مادده بە گوێی مرۆڤدا دەدات تا لە ناخی دڵدا جێیان دەکاتەوە. ئەو کاتەش مرۆڤ بە ئاسانی لەو گێژاوە ڕزگاری نابێت.

پاشان ئەو ئەدەبە بیانییەی کە ئاوێتەی هەرزەییە، هیچ سوودێك بەو نیگەرانی و شڵەژاوییەی "گیان"ی مرۆڤ نابەخشێت کە ئەنجام و بەروبوومی گومڕاییە. بەڵكو بە ڕواڵەت هێمنی دەکاتەوە و بە پەنامەکیش پتر گەشەی پێ دەسێنێت! پێیشی وایە کە ڕێگا چارەیەکی بۆ ئەو گیروگرفتە دۆزیوەتەوە و لەو گومانەشدایە کە تاکە چارەسەر بێت. ئەویش بریتییە لەو داستان و ڕۆمانانەی پێشکەشیان دەکات. خۆ ئەگەر سەرنج لەمانەش بدەیت، دەبینیت:

لە ڕێی کتێبەوە دەیانخاتە ڕوو.. کە زیندوویەکی مردووە!

یان لە ڕێی سینەماوە.. کە چەند مردوویەکی بزۆکن..

یاخود شانۆ.. کە تارماییەکانی تێدا دەژیێنەوە و بە پەلە و یەك لە دوای یەك لەو گۆڕستانە فراوانەوە دێنەدەر کە ناوی "ڕابوردوو"ی لێ نراوە!

ئەمەیە جۆرەکانی ڕۆمانی ئەو ئەدەبە..

ئیتر مردوو چۆن دەتوانێت ژیان ببەخشێت؟!

ئەو ئەدەبە بیانییە، بێ هیچ شەرم و ڕوویەك، زمانێکی درۆزنی لە دەمی مرۆڤدا جێگیر کردووە و، چاوێکی فاسق و لە ڕێ ترازاویشی لە ڕوخساریدا داناوە و، کراسی ئافرەتە سەماکەرێکی بێ ئابڕووشی بە بەری دنیا پۆشیوە!

ئایا ئەم ئەدەبە لە کوێ "جوانیی موجەڕڕەد" دەناسێت و چۆن پێی ئاشنا دەبێت؟!

تەنانەت گەر بیەوێت "خۆر" پیشانی خوێنەرەکەی بدات، ئەوا ئافرەتە ئەکتەرێکی لەشولار جوانی سووربااوی قژ زەردی یاد دەخاتەوە.

ئەو ئەدەبە بیانییە بە ڕواڵەت دەڵێت:

(هەرزەیی ئەنجامەکەی ناهەموارە و شایستەی مرۆڤ نییە) جگە لەمە، ئەنجامە زیانبەخشەکانیشی دەخاتە ڕوو..

بەڵام وێنەی ئەو "هەرزەیی"یە بە شێوەیەك دەکێشێت کە لیك بە دەماندا دەهێنێتە خوارێ و، جڵەوی "ژیری"یەکان لە دەستی خاوەنەکانیان دەترازێنێت، هێندەش ئاگر لە هەوا و هەوەس و ئارەزووەکان بەردەدات و دەیانوروژێنێت تا بە جارێ پەتیان پێ دەبچڕێت و هانیان دەدات ملکەچی هیچ شتێکی تر نەبن!

**بەڵام هەرچی ئەدەبی قورئانی پیرۆزە:**

هەوا و ئارەزووی مەنگ و بێدەنگی مرۆڤ ناشڵەقێنێت و هەرگیز نایانوروژێنێت، بەڵکو هەستی خۆشویستنی "ڕاستی" و عەوداڵبوون بە دوای

"حەقیقەت"دا بە مرۆڤ دەبەخشێت.. شەیدای جوانیی موجەڕڕەدی دەکات.. تامی عیشقی "جوانی" و تاسەمەندیی خۆشویستنی "ڕاستی"ی پێ دەچێژێت.. هەرگیز خوێنەرانی ناخەڵەتێنێت.

ئەدەبی قورئان لە گۆشەی سروشتەوە ناڕوانێتە بوونەوەران. بەڵکو بە سنعەتێکی خوایی و جێدەستێکی میهرەبانیی خواوەندیان دەبینێت و دەیانخاتە ڕوو، بێ ئەوەی ژیریی هیچ کەسێك گرفتاری سەرگەردانی بکات.

لەبەر ئەوە، ئەم ئەدەبە:

نووری "ناسینی بەدیهێنەر" بە گوێی مرۆڤدا دەدات و.. نیشانەکانی ئەو بەدیهێنەرەش لە هەموو شتێکدا ئاشکرا دەکات.

ئنجا هەردوو ئەدەبەکە "خەم"ێکی کاریگەر لە ناخی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵن، بەڵام هیچ کام لەو خەمانە لەیەك ناچن؛ چونکە:

ئەو خەمەی ئەدەبی خۆرئاوا لەدڵدا بەجێی دەهێڵێت، چەشنی پەژارەی کەسێکی خەفەتبارە.. خەمێك لە نەمانی خۆشەویستان و، لەدەستچوونی خاوەن و، نەبوونی پەنا و پشتیوانەوە سەری هەڵداوە.

ئەو ئەدەبە هەرگیز ناتوانێت خەمێکی بەرز و بڵند و شیاو بە مرۆڤ ببەخشێت، چونکە ئیلهام وەرگرتنی هەست و نەستی ئەدیب لە "سروشت"ێکی کەروکاس و "هێز"ێکی چەواشە و کتوکوێر، ئازار و پەژارەیەکی وەها دەهاوێتە ناو ئەدەبەکەیەوە کە جیهانی لە بەرچاودا دەکات بە ماتەمینگایەکی سەرانسەری و، مرۆڤیش دەخاتە ناوەندی بێگانە و کەسانێکی نامۆ، بێ ئەوەی پارێزگار و پشت و پەنا و خاوەنێکی بۆ فەراهەم بهێنێت!

بەم چەشنە، مرۆڤ لە ماتەمینییەکی بەردەوامدا دەهێڵێتەوە و، چرای ئاواتەکانی قووڵایی ناخیشی - یەك لە دوای یەك - لێ دەکوژێنێتەوە! تا لە ئەنجامدا ئەم هەستە ئازاربەخش و پەژارە بەسۆیە بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێت و، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو گومڕایی و ئیلحاد و ئینکاریی "بوون"ی بەدیهێنەری

مەزنی دەبات. هێندەش لە ڕێ دەیترازێنێت کە گەڕانەوەی بۆ سەر ڕاستەشەقام گەلێ دژوار و دەگمەن دەبێت و، لەوانەشە هەر هەوڵێك لەم پێناوەدا بدرێت بێ ئاکام دەربچێت!

بەڵام ئەدەبی قورئانی پیرۆز:

"خەم"ێکی بەرز و بڵند و ناسك بە مرۆڤ دەبەخشێت؛ خەمی عاشقان نەك هی پەژارەی هەتیوان.. خەمێك کە لە جودایی خۆشەویستانەوە هەڵقوڵاوە، نەك لە تیاچوون و نەمانیان..

لەو گۆشەیەوە دەڕوانێتە بوونەوەران کە هەر هەموویان سنعەتی خوای گەورەی بینەر و میهرەبانن، نەك لە گۆشەی "سروشت"ی کتوکوێرەوە. تەنانەت هێندە سروشت فەرامۆش دەکات کە هەر لێشی نادوێت! بەڵکو "توانستی خاوەن دانست" و "چاودێریی گشتیی خواوەند" ڕوون دەکاتەوە، لە بریی ئەو "هێز"ە کتوکوێرەی کە ئەدەبی بیانی ئیلهامی لێ وەردەگرێت.

لە گۆشە نیگای ئەدەبی قورئانەوە بوونەوەران شێوەی ماتەمینگایەکی سەرانسەری و سامناك ناگرنە خۆیان. بەڵکو بوونەوەران لە بەرچاوی ئەو ئەدەبەدا دەبن بە کۆڕ و کۆمەڵێکی خۆشەویستی یەکتری. چونکە هاودەنگی و بەدەم یەکەوە چوونی بەشەکانی بوونەوەران لە هەموو گۆشەیەکی گەردووندا دەبینرێت و لە گشت لایەکیشیدا هاودەمی و خۆشەویستیی یەکتریی تێدا بەرچاو دەکەوێت و، لێڵی و دڵتەنگیی تێدا بەدی ناکرێت.

خەم و پەژارەی عاشقانە، ئاوایە!

مرۆڤ لە ناوەندی کۆڕێکی ئاوەهادا، ئیلهامی هەستێکی بەرز و باڵا وەردەگرێت، نەك پەژارە و خەمێك کە پتر دڵانی پێ تەنگ و تار دەبن!

هەردوو ئەدەبەکە "شەوق و شادی" بە مرۆڤ دەبەخشن..

بەڵام ئەو شەوق و تاسەمەندییەی ئەدەبە بیانییەکە پێی دەدات، هەوا و ئارەزووەکانی دەبزوێنێت و، دەرگای بۆ هەوەسبازیی "دەروون"ی لێ دەخاتە

سـەر پشـت. بـێ ئەوەی هـیچ چەشـنە خـۆشی و شـادمانییەك بە "گیـان"ی ببەخشێت!

هەرچی ئەو شەوق و تاسەمەندییەشە کە قورئانی پیـرۆز دەیبەخشـێت، ئەوا گشت گۆشە و کەنارەکانی "گیان"ی مرۆڤ بۆی دەلەرێتەوە و گیانی ئەو بەرەو بەرزاییەکان سەردەخات!

هەر لەسەر بناغەی ئەم نهێنییەشە کە:

شەریعەت "نەهی"ی لە "لەهوو"(کاری گاڵتە وگەپ) و هەر شتێك کردووە کە مـرۆڤ بەرەو لەهــوو ببـات. ئەوەتـا هەنـدێ ئــامرازی "لەهـوو"ی حەرام کردووە و، هەندێکی تریشیانی بە موباح داناوە..

بەو واتایەی کە:

هەر ئامرازێك کاریگەریی خەم و شەوقێکی قورئانییانەی بەجێ دەهێشـت، زیانی نییە..

بەڵام گەر کاریگەریی خەم و پەژارەی هەتیوانەی لە مرۆڤدا جێ دەهێشت و، شەوقی هەواو ئارەزووی "دەروون"ی لەودا دەورووژاند، ئەوا بەکارهێنـانی ئەو ئامرازە بە "حەرام" دادەنرێت.

ئەم حاڵەتەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێـت و.. هەمـوو خەڵـکی، لەم هەست و نەستەدا، یەکسان نین.

* * *

## پەلی درەخت بە ناوی "میهرەبانیی خوا"وە بەروبوومەکانی پێشکەش دەکات

بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێـت کە پەلەکـانی درەختـی بەدیهـاتووان بەری نیعمەتەکان بە دەستی زیندەوەرانی سەرانسەری جیهان دەگەیەنن..

کەچی لە ڕاستیدا بەروبـوومی پەلی ئەو درەختـانە لە دەسـتی میهرەبـانی و توانستی خواوە پێشکەش بە ئێوە دەکرێن.

کەواتە ئێوەش بە "شوکرانەبژێری" ئەو دەستی میهرەبانییە مـاچ بـکەن و، بە منەتباری و پێزانینیش ئەو دەستی توانستە تەقدیس بکەن!

* * *

## ڕوونکردنەوەی ئەو سێ ڕێگایانەی کە لە کۆتایی سوورەتی "فاتیحە"دا ئاماژەیان بۆ کراوە

برام!

ئەی ئەو کەسەی کە دڵ و دەروونی بە هیوا و ئاواتی گەش قوڵپ دەدات!

"ئەندێشە"ت بە دەستەوە بگرە و لەگەڵ مندا وەرە..

وا ئێستا ئـێمە لەسـەر زەویـیەکی بەرینـداین و بـێ ئەوەی کەس بمانبینێـت سەیری هەموو لایەنێکی ئەو زەوییە دەکەین. بەڵام وا هەورێکی ڕەش خێـوەتی بەسەردا هەڵداین و لەسەر چیا بەرزەکان نیشتەوە و، تەنانەت ڕووی زەویشی بە تاریکـــایی داپــۆشی بە ڕادەیەك کە دەڵێــت بنمیچــێکی ڕەقــی ئەســتوورە بەســەرمانەوە. بەڵام لە ڕووەکــەی تریـدا خـۆر دەبینرێـت. خــۆ ئـێمەش لەم ڕووەدا و لە ژێر ئەو هەورە چڕ و پڕەداین و، وەخـتە نەتـوانین بەرگەی تەنـگ و تاریی ئاوا بگرین و، بێزاری و دڵتەنگی خەریکن دەمانخنکێنن، چونکە نەمـانی هەوا و هەناسەنەدان مرۆڤ لەناو دەبات..

لەم کاتەدا کە ئێمە بەم حاڵەوە لە تەنگانەیەکی خنکێـنەردا دەتلێیـنەوە، سـێ ڕێگامـــان لە بەردەمــدا کــرانەوە کە مــرۆڤ بەو جیهــانە ڕوونــاکەی ئەودیــو دەگەیەنن. پێشتر جارێك هاتین و ئەو جیهانەمان بینـی وا ئێسـتاش بە جیاجیـا یەك بە یەکی ئەو سێ ڕێگایە دەبڕین:

◆ **ڕێی یەکەم:**

زۆربەی خەڵکی لەم ڕێیەوە دەڕۆن، چونکە گەشتێکە بە دەوری دنیادا و حەزی گەشتوگوزاریش بۆ ئەم ڕێیە کێشمان دەکات. وا بە پێ ئەم ڕێیەمان گرتەبەر.. ئەوەتا ڕووبەڕووی دەریای لمی ئەم دەشتە بەرینە بووینەتەوە. بڕوانە چۆن ڕقی لێ هەڵگرتووین و هەڕەشە و گوڕەشەمان لێ دەکات.. ئنجا بۆ شەپۆلە مەزنەکانی ئەم دەریا گەورەیە بڕوانە کە بە ئەندازەی چیاکان دەبن و، بە تووڕەبوونەوە بەگژماندا دێن.. بەڵام وا سوپاس بۆ خوا گەیشتینە ڕووەکەی تر و هەناسەی ئاسوودە هەڵدەکێشین و ڕووی ڕووناکی خۆر دەبینین، کەچی کەس ڕادەی ئەو ئازارانە نازانێت کە ئێمە لەم گەشتەدا چەشتمان و لە درێژایی ئەم ڕێیەدا گرفتاری بووین.

بەڵام بەداخەوە، وا جارێکی تر هاتینەوە بۆ سەر ئەم زەوییە سامناکەی کە پەڵە هەوری تاریك دایپۆشیوە و، گەلێ پێویستمان بە جیهانێکی ڕووناك هەیە کە بینایی دڵ(بەسیرەت)مان بکاتەوە. جا ئەگەر تۆش ئازایەتی لە خۆتدا شك دەبەیت فەرموو لەم ڕێگا ترسناکە پڕ لە گیروگرفتەدا هاوڕێیەتیم بکە، وا بە ئازایەتی و چاونەترسانەوە خۆمانی لێ دەدەین، کە ئەویش بریتییە لە:

◆ **ڕێی دووهەممان:**

لەم ڕێیەدا زەوی هەڵدەکەنین و تونێلی تێدا دروست دەکەین، تاکو بگەینە ڕووەکەی تری زەوی و سەرمان لەوێ دەربچێت.. وا لەناو تونێلە سروشتییەکانی زەویدا هەنگاو دەنێین و سام و ترس دەورەی داوین.. کاتی خۆی من ئەم ڕێگایەم دیبوو، بە ترس و لەرزەوە پیایدا تێپەڕیبووم، بەڵام ئەو کاتە ئامێرێك (یان ماددەیەك)ی ئەوتۆم بە دەستەوە بوو کە زەویی سروشتیی لە ڕێگامدا دەتواندەوە و کوناودەری دەکرد و ڕێگای بۆ خۆش دەکردم. ئەو ماددەیەش قورئانی پیرۆز لە ڕێی سێهەمدا پێی بەخشیبووم..

بـرام! دەسـتم لـێ بەرمەدە و شـوێنم کەوە.. هەرگیـز مەترسـە.. بـڕوانە وا چەندین ئەشکەوتی وەك تونێلەکانی ژێـر زەوی لە بەردەمتـدان، چاوەڕوانمـانن ڕێگامان بۆ دیوەکەی تر بۆ ئاسان دەکەن.. توند و ڕەقیی سروشـتی ئەم زەویـیە نەتترسێنێت، چونکە ئەو دەموچاوە گرژە ڕووی گەش و خەندانی خـاوەنەکەی لە پشـتەوەیە و، ئەو ئـامێرە قورئـانییەش کە بە دەسـتمەوەیە وەك "ڕادیـۆم" ماددەیەکی تیشکبەخشی ڕووناکە.

برام مژدە بێـت! وا هـاتینە دەرەوە و گەیشـتینە جیهـانی ڕوونـاك.. سـەیری زەویی جوان و ڕەنگین بکە و بۆ ئاسمانی ناسکۆڵە و ڕازاوە بڕوانە..

ئایا - براکەم! - سەرت بەرز ناکەیتەوە تـا ئەم شـتە ببینیـت کە سەرتاسـەری ڕووی ئاسمانی داپۆشیوە و لە سەرووی ئاسمان و هەورەکانیشەوەیە؟..

ئەمە قورئـانی پیـرۆزە.. درەختـی توویـای بەهەشـتە.. لـق و پەلی بـۆ سەرانسەری گەردوون هاویشتووە و هەر ئەوەندەمان لەسـەرە کە دەسـتمان لەم لقە شـۆڕەوەبووەی گیر بکەین و خۆمـانی پێـدا هەڵواسـین، ئەوەتـا لـێمانەوە نـزیکە و دەمـانگەیەنێتە ئەوێ بـۆ لای ئەو درەخـتە ئاسـمانییە بەرز و بڵنـدە. شـەریعەتی خـاوێنی ئیسـلام نمـوونەیەکی پوخـت و بچـووکی ئەو درەخـتە پیرۆزەیە.

کەواتە ئێمە دەمانتوانی ئەو ڕێگایە بگرینەبەر و لەوێـوە بگەیـنە ئەو جیهـانە ڕووناکە.. دەمانتوانی ڕێی شەریعەت بگـرینە بەر و گرفتـاری هـیچ سـەختی و گیروگرفتێکیش نەبین.. بەڵام ڕێگامان هەڵە کرد.

دەبا بگەڕێینەوە دواوە بۆ دۆخی پێشوومان تاکو ڕێگا ڕاستەکە بگـرینەبەر.. کە بریتییە لە:

◆ **ڕێی سێهەممان:**

بـڕوانە! وا بانگەوازکـارە مەزنەکە لەسـەر ئەم چیـا سـەخت و بڵنـدانە ڕاوەستاوە و، بانگ دەدات و دەڵێت: فەرمـوون بەرەو جیهـانی ڕوونـاکی.. ئەو

بانگوێژە مەزنە کە محەممەدی هاشمییە ﷺ تەنها دوو مەرجی لەسەر داناوین کە "نوێژ" و "پاڕانەوە"ن.

سەیری ئەم شاخانە بکە کە چیای "هودا"ن و هەورەکانیان بڕیوە و سەریان لە ئاسمانەکان گیر کردووە..

بۆ چیا بڵندەکانی شەریعەت بڕوانە کە ڕووی زەوییان ئارایشت داوە و بە گوڵزاری ڕەنگین ڕازاندوویانەتەوە.. ئێمە هەر هێندەمان دەکەوێتە ئەستۆ کە بە باڵی هیممەت بفڕین تاکو ڕووناکیی ئەوێ و نووری جوانییەکەی ببینین..

بەڵێ، ئەمە چیای خۆشەویست و ئازیزی "تەوحید"ی تەوحیدە لێرەدا و.. ئەوەش چیای گەردنکەشی بێ وەی و دڵنیایی بەخشی "جوودی"ی ئیسلامە و.. ئەوی دیکەش "جبل القمر"ی قورئانی گەشەدارە کە ئاوی زوڵاڵی نیلی بەخوڕ لەبەر دەڕوات. دەسا تۆش لەو ئاوە سازگارە سەلسەبیلە بخۆرەوە، نۆشی گیانت بێت.

﴿فتبارَكَ اللّهُ أحْسَنُ الخَالقِيْنَ﴾.

وآخِرُ دعْوَانا أنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنْ.

کاکی هاوڕێم!

ئێستا واز لە ئەندێشە بێنە و، بە "ژیری"ت بڕوانە و بیر بکەرەوە.

دوو ڕێی یەکەم هی: ﴿الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ و ﴿الضَّالِّيْنْ﴾ن، کە گەلێ مەترسی و گیروگرفتی زۆریان تێدایە و، زستانێکی هەمیشەیی بێ بەهارن. تەنانەت لەوانەیە لە سەد کەسی ڕێبوارانی ئەو دوو ڕێیە، جگە لە یەکێکی وەك ئەفلاتوون و سوقرات، کەسی تر ڕێ دەرنەبات و بە ئەنجام نەگات.

بەڵام ڕێی سێهەم ڕێیەکی کورت و ئاسانە؛ چونکە ڕاستەڕێیە و، بەهێز و لاواز تیایدا یەکسانن و، هەموان دەتوانن بیبڕن و پیایدا تێپەڕ ببن.

بەڵام باشترین و بێوەیترین ڕێ ئەوەیە کە:

خوای گەورە "شەهیدی"ت پێ ببەخشێت، یان بە شەرەفمەندیی "جیهاد" بەهرەمەندت بکات!

وا ئێستا ئێمە گەشتووینەتە ئەوەی ئەنجامی گەشتەکەمان بدەین بە دەستەوە:

دەهاء(زیرەکی)ی زانستی، دوو ڕێگاکانی یەکەم دەگرێتەبەر.

بەڵام "هودا"ی قورئانی پیرۆز، کە ڕاستە شەقامە، بریتییە لە ڕێی سێهەم کە دەمانگەیەنێتە ئەوێ.

**اللّٰهُمَّ ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۞ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾** آمین!

* * *

**هەموو ئازارێك لە گومڕاییدایە و، هەموو چێژ و لەزەتێکیش لە ئیماندایە**

(ڕاستییەکی گەلێ مەزنە، بەرگی ئەندێشەی پۆشیوە)

ئەی هاوڕێی هۆشیارم!

گەر دەتەوێت جیاوازیی ئاشکرای نێوان ڕێبازی ڕووناکی **﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾** و ڕێی تاریکی **﴿الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾** و **﴿الضَّالِّينَ﴾** ببینیت، ئەوا "وەهم"ی خۆت بە دەستەوە بگرە و سواری پشتی "ئەندێشە" ببە.. وا پێکەوە دەڕۆین بۆ تاریکستانی عەدەم، ئەو گۆڕستانە مەزنەی کە لە مردووان پڕ بووە. چونکە خواوەندی بەتوانای شکۆمەند بە دەستی توانستی خۆی ئێمەی لەو تاریکستانە دەرهێناوە و، سواری کەشتیی ئەم "بوون"ەی کردووین و، بۆ ئەم دنیایەی هێناوین کە چێژ و لەزەتی ڕاستەقینەی تێدا نییە..

وا هاتین و گەیشتینە ئەم جیهانی "وجوود"ە، کە دەشتاییەکی یەکجار فراوانە. هەر کە چاومان کرایەوە سەیری شەش لاکانی خۆمانمان کرد:

کە بۆ بەردەممان ڕوانی، چەندەها بەڵا و ئازار و گیروگرفتمان دی کە دەیانویست بە وێنەی دوژمن پەلامارمان بدەن.. ئێمەش لە ترساندا کشاینە دواوە..

ئنجا سەیری لای ڕاست و چەپمان کرد و چاوەڕوانی سۆز و بەزەیی بووین لە سروشت و ماکەکان.. بەڵام بینیمان هێندە دڵڕەقن کە نازانن بەزەیی چییە و، دانیان لێ جیڕ کردووین و، بە تووڕەبوونەوە بۆمان دەڕوانن و، گوێ بۆ لالانەوەمان ڕاناگرن و پاڕانەوەی زۆریش دڵیان نەرم ناکات..

لە ناچاریدا بۆ لای سەرەوەمان ڕوانی و داوای یارمەتیمان لە تەنە ئاسمانییەکان کرد. بەڵام ئەو تەنانە سامناك هاتنە پێش‌چاومان و هەڕەشەیان لێ دەکردین، چونکە بە خێراییەکی لەڕادەبەدەری وێنەی بۆمباکان دەردەپەڕین و، بێ ئەوەش لە یەك بدەن هەموو گۆشە و لایەکی بۆشایی ئاسمان دەگەڕان. خۆ ئەگەر لە ڕێگەی خۆیان بترازانایە و بە هەڵە ڕێیان ون بکردایە ئەوا - پەنا بە خوا - ناوجەرگەی ئەم جیهانە بینراوە وەك بۆمبا دەتەقییەوە. چونکە ئایا جڵەویان بە دەستی ڕێکەوتەوە نییە؟ ئایا ڕێکەوت خێر و چاکەی لێ دەوەشێتەوە؟!

پاشان بە نائومێدییەوە ڕوومان لەم لایەش وەرچەرخاند و گرفتاری سەرسامییەکی سەخت بووین و، سەرمان داخست و، خۆمان لەناو سنگ و دەروونی خۆماندا شاردەوە و، بۆ ناو دەروونی خۆمانمان ڕوانی.. یەکسەر هەزاران هاوار و ناڵەمان بۆ هەزاران دەستکورتی و هەژاری هاتە گوێ کە تێکڕا لە دەروونە لاوازەکانمانەوە دەردەچوون! لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی دڵنەواییمان لەم لایە دەکرد، کەچی بێزاری کردین و بۆمان دەرکەوت کە هیچ سوودێکمان لەم لایەش دەستگیر نابێت..

بۆیە هانامان بۆ "ویژدان"ی خۆمان برد و بە دوای دەرمانی ئەو دەردانەدا دەگەڕاین، بەڵام بەداخەوە دەرمانمان تێدا دەست نەکەوت، بەڵکو دۆزینەوەی

دەرمانی زامەکانی ئەویش کەوتە ئەستۆی ئێمەوە! چونکە هەزاران ئاوات و، ئارەزوو و، هەست و نەستی گەورە و درێژخایەنی تا سەرانسەری گەردوونیان تێدا جۆش دەخوات.. بۆیە لە ترسانا و لەبەر ئەوەی کە دەستەوسان بووین و نەمانتوانی خواستەکانی بۆ بهێنینەدی، گەڕاینە دواوە. ئەوەتا مرۆڤ هێندە هیوا و ئاواتی تێدا جەم بووە کە لە ئەزەلەوە تا ئەبەدیان گرتووەتەوە، تەنانەت گەر سەرانسەری دنیاش قووت بدەن هێشتا هەر تێر نابن.

بەم جۆرە بۆ هەر لایەکمان دەڕوانی ڕووبەڕووی گرفت و بەڵا دەبووینەوە.

ئەمە ڕێگەی ﴿الضَّالِّيْنَ﴾ و ﴿الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ە. چونکە لەم ڕێیەدا ڕوانین ئاراستەی سروشت و گومڕایی کراوە. جا لەبەر ئەوەی ئێمەش ئەو چاویلکەیەمان لە چاو کرد ئەوا گرفتاری ئەو حاڵە بووین و، بە جۆرێکی کاتی بەدیهێنەر و حەشر و مەبدەء و مەعادمان لە بیر چووەوە و، دەرکەوت ئەم بیر و بۆچوونە لە دۆزەخ زیاتر ئازاری سەخت و سووتێنەر دەرخواردی "گیان"ی مرۆڤ دەدات. ئەوەبوو کە لەو ڕوانگەیەوە بۆ هەر شەش لاکانمان ڕوانی، جگە لەو حاڵەتەی کە پێکهاتبوو لە ترس و سام و کۆڵەواری و لەرز و دڵەتەپێ و بێ هاودەمی و هەتیوی و نائومێدی، کە ویژدانی مرۆڤ دەگووشن، هیچی ترمان دەست نەکەوت.

دەبا ڕووبەڕوویان ببینەوە و هەوڵ بدەین لە خۆمانیان دوور بخەینەوە.

لە پێشدا سەیری توانستی خۆمان دەکەین.. بەداخەوە دەبینین لاواز و دەستەوسانە.. پاشان ڕوو لە دابینکردنی پێداویستییەکانی دەروونی تینوومان دەکەین.. دەبینین بەردەوام هاوار دەکات، کەچی نە کەس وەڵامی دەداتەوە و نە فریادڕەسێکیش بەدەم داد و فریادی ئەو ئاواتانەوە دەڕوات. بۆیە کەوتینە گومانەوە کە هەموو شتێك لە دەوروبەرماندا دوژمنمانە و پێمان نامۆیە.. دڵمان بە هیچ شتێك ناکرێتەوە و چ شتێك دڵمان خۆش ناکات و هیچ چێژ و لەزەتێکی ڕاستەقینە شك نابەین.

پاش ئەوە، هەتا سەیری قەبارە و تەنەکانی ناو ئەم گەردوونەشمان بکردایە، "ویژدانمان" لە ترس و بیم و، "ژیریشمان" لە وەهم و دوودڵی، پڕ دەبوون.

براکەم!

ئەمەیە ڕێی گومڕایی و، ئەوەش ماهییەتەکەیەتی. خۆ بە چاوی خۆمان تاریکایی نووتەکی کوفرمان تێدا بینی!

بەڵێ هاوڕێکەم! با ئێستا جارێکی تر بڕۆینەوە بۆ "عەدەم" و پاشان لەوێوە بێینەوە. ڕێی ئەم جارەمان ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ە و، دەلیلمان چاودێریی خوایە و، ڕچەشکێن و پێشڕەویشمان قورئانی پیرۆزە.

بەڵێ، کاتێ خواوەندی بەخشندە ویستی بەدیمان بهێنێت، توانستی ئەو، بە میهرەبانی و فەزڵی خۆی، لە عەدەم دەری هێناین و، سواری یاسای ویستی خواوەندی کردین و، بە ناو چەندەها پلە و بارودۆخی جۆراوجۆردا بردینی، تا هێنایینیە ئێرە و، بە میهرەبانیی خۆی پۆشاکی "بوون"ی خەڵات کردین و، بە بەخشینی پلەی ئەمانەتیش ڕێزی لێ ناین، کە نیشانەکەی "نوێژ" و "پاڕانەوە"یە..

هەموو یەکێك لەو پلە و بارودۆخە جۆراوجۆرانە مەنزڵێکە لە مەنزڵگاکانی لاوازیمان لەم ڕێگا درێژەماندا. قەڵەمی قەدەریش فەرمانەکانی خۆی لە ناوچاوانماندا نووسیوە تاکو کارەکانمان بە ئاسانی بەڕێوە بچێت. ئەوەتا لە هەر جێگایەکدا ببین بە میوان، بە ڕێزلێنان و بەخێرهاتنی برایانە پێشوازی دەکرێین. چیمان لا یە تەسلیمیان دەکەین و لە ماڵ و سامانی ئەوانیشمان دەست دەکەوێت. بەم جۆرە، بازرگانییەکەمان بە خۆشەویستی و پەیوەندیی برایانە و پێکەوەگونجان بەڕێوە دەچێت و، لەو میوانداریيەدا تێرمان دەکەن و، دیاریی زۆرمان لە کۆڵ دەنێن و، پاشان بە ڕێزلێنانێکی زۆرەوە بەڕێمان دەکەن..

بەم جۆرە، ڕێگامان بڕی تا گەیشتینە دەرگای دنیا و دەنگەکانمان بەرگوێ کەوت.

وا گەیشتین و هاتینە ناوی.. پێمان نایە ناو ئەم جیهانە بینراوەی کە پیشانگای خواوەندی میهرەبانە و، شوێنی پێناساندن و ناوبانگ دەرکردنی دروستکراوانیەتی و، جێگای قرەقڕ و هاتوهاواری مرۆڤە.. کە هاتینە ناوی لە دەوروبەری خۆمان بە تەواوەتی نەشارەزا بووین و ڕێنما و پێشڕەومان تەنها ویستی خوای میهرەبان بوو کە چاوە ناسکۆڵەکانمان وەکیلی ئەو ویستە خواییە بوون.

وا چاوەکانمان کرانەوە و بە هەموو گۆشەیەکی دنیادا ڕوانیمان..

ئایا هاتنی جاری پێشوومانت بۆ ئێرە دێتەوە یاد؟ کە نامۆ و هەتیو بووین و، بێ هیچ پشت و پەنایەك کەوتبووینە ناو چەندین دوژمنی لە ژمارەبەدەرەوە؟

بەڵام ئەم جارە نووری ئیمان "خاڵی پشت پێ بەستنمان"ە کە داڵدە و پەنایەکی مەحکەم و قایمە لە بەرامبەر دوژمنەکانمانەوە.

بەڵێ ڕاستە "ئیمان بە خوا" نووری ژیان و ڕووناکیی گیان و گیانی ڕۆحەکانمانە! ئەوەتا دڵەکانمان بەم ئیمانە دڵنیایی بەدەست هێناوە و گوێ بە دوژمنان نادات، تەنانەت هەر بە دوژمنانیشیان دانانێت!

لە ڕێی یەکەمدا ڕۆشتینە ناو ویژدان و دەنگی هەزاران هاوار و داد و فریادمان لێ بیست، ناچار لەناو ئەو بەڵایەدا شڵەژاین. چونکە ئاوات و ئارەزوو و هەست و توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ جگە لە "ئەبەد" بە هیچ شتێکی تر ڕازی نابن، خۆ ئێمەش ڕێی تێرکردنی ئەو ئاوات و ئارەزووانە نەشارەزا بووین.. نەشارەزایی ئێمە و هاوار و دادی ئەو یەکیان گرتبوو.

بەڵام ئێستا، سوپاس و پێزانین بۆ خوای گەورە، "خاڵێکی یارمەتیدان"ی ئەوتۆمان دۆزیوەتەوە کە ژیان بە بەر ئەو ئاوات و لێهاتنانەدا دەکات و، ڕێی

هەمیشەییان پێ دەگرێتەبەر و ئاوی زوڵاڵی ژیانیان پێ نۆش دەکات، ئیتر هەریەکەیان بۆ کەماڵی خۆیان تێدەکۆشن.

جا ئەم خاڵە شەوق بەخشە (واتە ئەم خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتنە) بریتییە لە جەمسەری دووهەمی ئیمان کە ئیمان بوونە بە ڕۆژی دوایی و، کە "بەختەوەریی هەمیشەیی"ش گەوهەری سەدەفی ئەو ئیمانەیە.

بەڵگەی ئیمان بریتییە لە "قورئان" و "ویژدان" کە نهێنییەکی بەرزی مرۆڤە.

ئەی هاوڕێکەم!

سەرت بەرز بکەرەوە و چاوێك بە بوونەوەراندا بگێڕە و لەگەڵیاندا بدوێ.. ئایا لە ڕێی یەکەمدا سامناك نەبوون؟ ئەی ئایا نابینیت وا ئێستا چاوەکانمان بە وێنەی هەنگ بە هەموو لایەکی باخ و بێستانی ئەم گەردوونەی کە گشت گۆشەیەکی دەمی بە گوڵ پشکوتووە، دەفڕن و شیلەی خاوێنی ئەو گوڵزارانە هەڵدەمژن؟ ئەوەتا هەموو گۆشەیەکی گەردوون هاودەمی و دڵدانەوەی تێدایە و خۆشەویستی و دەست لەملانێی پێوە دیارە.. ئیتر چاوەکانمان ئەو دیارییە خۆش و خاوێنانە دەقۆزنەوە و، بە وێنەی هەنگوین یەك لە دوای یەك شیلەی "شایەتیدان" بۆ ناو ناخی مرۆڤ دەچۆڕێنن.

هەر کاتێکیش چاومان بە جموجووڵی خۆر و ئەستێرەکان دەکەوێت، یەکسەر بە دەستی دانستی بەدیهێنەریان دەسپێرێت و، دەرسی پەند و درەوشانەوەی ڕەحمەتیان لێ بەدەست دەهێنێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی "خۆر" لەگەڵماندا دەدوێت و پێمان دەڵێت:

(برایانم! لە من بێزار مەبن! بەخێربێن سەرچاو.. ماڵی خۆتانە.. منیش وەك ئێوە خزمەتگوزارێکی گوێڕایەڵم، خواوەندی تەنیای صەمەد تەنها بە فەزڵ و میهرەبانیی خۆی منی خستووەتە کار و ژێرباری خستووم تاکو ڕووناکیتان بۆ دابین بکەم. کەواتە دابینکردنی ڕووناکی و گەرمی بە من سپێرراوە و، نوێژ و پاڕانەوەش لە ئەستۆی ئێوە نراوە)!

هاوڕێکەم!

بۆ مانگ.. بۆ ئەستێرەکان.. بۆ دەریاکان بڕوانە. ئەوەتا هەریەکەیان بە زمانی تایبەتیی خۆی بەخێرهاتنمان دەکات و پێمان دەڵێت: یاخوا بەخێربێن، سەرچاومان هاتن!

کەواتە تۆش - براکەم! - بە چاویلکەی "هاوکاری" بڕوانە و بە گوێی "ڕێسا"یش گوێ ڕابگرە، ئەوەتا دەبیستیت کە هەموو یەکێك لەوانە دەڵێت:

(ئێمەش خزمەتکاری گوێڕایەڵ و ئاوێنەی بەزەیی و سۆزی خواوەندی میهرەبانین.. هەرگیز لە کارکردن بێزار نابین. دەسا ئێوەش لە ئێمە بێزار مەبن، لە نەعرەتەی بوومەلەرزە و هاواری ڕووداوەکان مەترسن، چونکە ئەو دەنگانە گمەی زیکر و ئاوازی تەسبیح و جریوەی تەهلیلەی نزا و لاڵانەوەکانن.. بەڵێ، ئەو کەسەی ئێوەی ناردووەتە ئێرە، هەر ئەو شکۆمەندە جوانەیە کە جڵەوی هەموو ئەوانەشی لە دەستدایە. "بینایی ئیمان" لە دەموچاوی ئەو بوومەلەرزە و ڕووداوانەدا ئایەتەکانی میهرەبانی دەخوێنێتەوە).

ئەی ئیمانداری دڵ بێدار!

با چاوەکانمان بحەوێنەوە و گوێکانمان لە بریی ئەوان بخەینەکار و بە ئیمانیان بسپێرین.

دەبا لە دنیادا گوێ لە ئاوازە خۆشەکان ڕابگرین.. چونکە ئەو دەنگانەی کە لە ڕێی پێشوومانداا بەرگوێمان دەکەوتن و، بە دەنگی ماتەمینییەکی گشتی و لاواندنەوەی مردوومان دەزانین، لەم ڕێیەدا دەنگی زیکر و تەسبیح و حەمد و شوکرانەبژێرین..

ئەوەتا گڤەی با و نەعرەتەی هەور و ئاوازی شەپۆلەکانی دەریا، هەموویان تەسبیحاتی بەرز و بڵندن و.. تکە و خوڕەی باران و گمە و جریوەی باڵندەکانیش تەهلیلەی میهرەبانی و چاودێرین.

ئنجا هەر هەمووشیان چەند "مەجاز"ێکن ئاماژە بۆ "حەقیقەت"ێك دەکەن.

بەڵێ، دەنگی هەموو شتێك زایەڵەی "بوون"ی ئەو شتەیە و دەڵێت: (مـن هەم).

بەم جۆرە سەرجەمی بوونەوەران پێکەوە دەدوێن و دەڵێن:

(ئەی مرۆڤی بێئاگا! ئێمە بە بێ گیان مەزانە)!

ئەوەتا باڵندەکان بە چەند دەنگێکی زوڵاڵ و چەندین دەنـووکی بچـووك لە چەشتنی نیعمەتێك یـان نـازڵبوونی ڕەحمەتێـك دەدوێـن و، لە پێشـوازیی ئەو میهرەبانییە بەخشراوەدا بە جریوەجریو دەست بە خوێندن دەکەن. بەڵێ ڕاسـتە، ئەو باڵنـدانە نیعمەتیـان بەسـەردا نـازڵ دەبێـت و "شـوکرانەبژێری"ش ئەو نیعمەتەیان بۆ بەردەوام دەکات و، بە زمانی حاڵ و لە ڕێی "هێما"وە دەڵێن:

(ئەی بوونەوەران! برایان! ئێمە گەلێ خۆشگوزەرانین.. ئایا نابینن کە چـۆن بە شـەفەقەت و میهرەبـانی پەروەردە دەکـرێین؟.. ئـێمە لەو بارودۆخـانەی کە تیایاندا دەژیین، ڕازی و دڵنیاین).

بەم چەشنە ئەو باڵندانە بە دەنوکە باریکەکانیـان سروودەکانیـان بە هەمـوو لایەکدا پەخش دەکەن، تەنـانەت دەڵێـی سـەرجەمی بـوونەوەران سـیمفۆنیای مۆسیقایەکی بەرز و بڵندن!

تەنها نووری ئیمانە کە گوێی لە زایەڵەی زیکرەکـان و ئـاوازی تەسـبیحاتی بوونەوەرانە، چـونکە ڕێـکەوتی کتوکـوێری هەڕەمەکی جێـی لەنـاو کاروبـاری گەردووندا نییە.

هاوڕێکەم!

وا ئێسـتا ئـێمە لەم جیهـانی میسـالە دەردەچـین و، لە دەرگـای "ژیـری"دا دەوەستین و، دەڕۆینە ناو ئەو گۆڕەپانە، بۆ ئەوەی شـتان بە تەرازووی "ژیـری" هەڵبسەنگێنین، تاکو ڕێگا جۆراوجۆرەکان لە یەکتر جیا بکەینەوە.

**ڕێی یەکەممان:**

ڕێی ﴿الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ و ﴿الضَّالِّينْ﴾ە.

ئەم ڕێیە هەستێکی ئازاربەخشی توندوتیژ لە قووڵایی ناخی ویژدانی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵێت و، ئەو هەست و نەستە ئازاربەخشانە لە ناخەوە دەهێنێتە سەر دەموچاوەکان و بەرجەستەیان دەکات..

ئێمەش لە ناچاریدا و بۆ مەبەستی ڕزگاربوونمان لەو بارە دژوارە خۆمان دەخەڵەتێنین و هەوڵ دەدەین ئەم ئازارانە لە شوێنی خۆیاندا ڕابگرین و، خەویان لێ بخەین و، هەست و نەستمان بە تەواوی نەهێڵین و بەتاڵیان بکەینەوە، دەنا هەرگیز ناتوانین بەرەنگاری ئەو داد و فریادە نەبڕاوانەی ناخی خۆمان ببینەوە! ئەوەتا هەوا و ئارەزووەکان هەست و نەستمان لە کار دەخەن و شعووری مرۆڤ سڕ دەکەن. شەهوەت و ئارەزووە جادووگەرەکانیش داواکاری "لەهو" و کاری گاڵتەوگەپن، تاکو "ویژدان" بخلافێنن و لە خشتەی بەرن و خەو لە "ڕۆح"یش بخەن و بێ هەستی بکەن تا ئاگای لەو ئازارانە نەمێنێت. چونکە هەست و شعووری مرۆڤ هێندە ئاگر لە ویژدان بەر دەدات کە لە تاو توندوتیژیی ئازارەکانی خۆی توانای بیستنی داد و هاواری ویژدانی نامێنێت..

بەڵێ ڕاستە، هەڵگرتنی ئازاری نائومێدی هەرگیز لە تواناادا نییە، چونکە ویژدانی مرۆڤ هەتا لە ڕاستەشەقام (الصراط المستقيم) لابدات ئەوا ئەو بارە دژوارەی پتر سەخت دەبێت، بە ڕادەیەك کە هەموو لەزەتێك شوێنەوارێکی ئازار لە ناخی ویژداندا بەجێ دەهێڵێت و، ئنجا زرق و برقی ئاوێتەبووی هەوا و ئارەزوو و لەهووی شارستانێتیش هەرگیز دادی نادات، چونکە چارەسەرییەکی بێکەڵکە و ژەهرێکی خەولێخەری ئەو دڵتەنگییەیە کە گومڕایی بەرهەمی دەهێنێت.

هاوڕێی ئازیزم! لە ڕێی ڕووناکی دووهەممانـدا هەستمان بە حەوانەوە دەکرد، هەر تەنها ئەو ڕێگایەیە کە سەرچاوەی هەموو چێژ و لەزەتێکە و ژیانی ژیانە، تەنانەت ئازارەکانیشی تێدا دەبن بە تام و چێژی خۆشی بەلەزەت! بەڵێ، ئێمە بەم جۆرە ئەم ڕێیەمان ناسی و هەستمان پێ کرد، چونکە ڕێگایەکە - بە پێی هێزی ئیمان - دڵنیایی ئاراستەی "گیان" دەکات و، وەك ئاشکرایە جەستەش بە لەزەتچەشتنی "گیان" لەزەت دەچێژێت و، گیانیش بە نیعمەتچەشتنی "ویژدان" لە ناز و نیعمەتدا دەژی.

"بەختەوەری"یەکی خێرا و حازر لەناو ویژدانی مرۆڤدا هەیە کە بەهەشتێکی مەعنەوییە و لە ناخی دڵدا جێگیر بووە. ئنجا "بیرکردنەوە"ش ئەو بەختەوەرییە دادەچۆڕێنێت و بە مرۆڤی دەچێژێت و، "هەست و شعوور"یش بەرجەستەی دەکات و دەیخاتە ڕوو.

ئێستا تێدەگەین و دەزانین کە بە ئەندازەی بێداربوونی دڵ و، جموجووڵی ویژدان و، هەست و نەستی گیان، لەزەت و خۆشییەکانیش زیاد دەکەن و، ئاگری "ژیان"یش دەبێت بە نوور و زستانەکەشی دەبێت بە هاوین!

بەم جۆرە، لەناو "ویژدان"دا دەرگاکانی بەهەشت دەخرێنە سەر پشت و، دنیا دەبێت بە بەهەشتێکی هێندە فراوان کە گیانەکانمان هاتوچۆی تێدا دەکەن. تەنانەت ئەو گیانانە بە دوو باڵی "نوێژ و پاڕانەوە" لە هەڵۆکانیش بڵندتر لەو بەهەشتەدا دەفڕن و بەرز دەبنەوە.

ئەی هاوڕێی خۆشەویستم!

وا ئێستا هەتا چاوپێکەوتنێکی تر لێك جیا دەبینەوە و بە خوای گەورەت دەسپێرم و، با هەر یەکەمان دوعا بۆ براکەی بکات.

اللَّهُمَّ ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيْمَ﴾.

* * *

## وەڵامێك بۆ كەنیسەی ئەنگلیكی

ڕۆژێكیان قەشەیەكی قینلەدڵ و سیاسی و فێڵباز و دوژمنی سەرسەختی ئیسلام، پرسیاری لە بارەی چوار شتەوە كردبوو كە دەیویست بە شەش سەد وشە وەڵام بدرێنەوە!

ئەم پرسیارانەشی بۆ مەبەستی وروژاندنی گومان و، بە دەرخستنی لووتبەرزی و گاڵتە پێ كردن و، دەربڕینی شادمانی بە شكستی موسڵمانان و، لە كاتێكی وا سەختدا ئاراستە كرد كە دەوڵەتەكەی دەستی لە گەرووی دەربەندەكانمان گیر كردبوو!

جا دەبێ سەبارەت بە خۆشحاڵییەكەی ئەو قین لە دڵە بە: "سەرت دای لە بەرد" وەڵام بدرێتەوە و، بەرامبەر بە فڕوفێڵەكانیشی دەبێ بە ڕقەوە پشتگوێ بخرێن، سەرەڕای وەڵامێكی دەمكوتكەریش كە لە بەرامبەر ئینكاریكردنەكەیەوە وەك چەكوش بدرێت بە تەوقی سەریدا!

بۆیە من ئەو دوژمنە سەرسەختە بە شایانی وەڵامدانەوە نازانم، بەڵكو وەڵامەكانمان بۆ ئەو كەسانەیە كە گوێ ڕادەگرن و عەوداڵی ڕاستین.

ئەمانەش وەڵامەكانن:

لە پرسیاری یەكەمدا وتبووی:

ئایینی محەممەد ﷺ چییە؟

وتم:

قورئانی پیرۆزە، كە بناغەی ئامانج و مەبەستەكانی جێگیركردنی شەش پایەكانی ئیمان و، قووڵكردنەوەی پێنج پایەكانی ئیسلامە.

لە دووهەمدا وتبووی:

ئیسلام چیی پێشكەش بە "بیر" و "ژیان" كردووە؟

وتم:

"یەکبوون"ی بە بیر و، "ئیستیقامەت"یشی بە ژیان پێشکەش کردووە. شایەتیشم لەمەدا ئەم فەرموودانەی خوای گەورەیە:

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾، ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾.

لە سێهەمدا وتبووی:

ئیسلام چۆن کێشە و ململانێکانی ئێستا چارەسەر دەکات؟

دەڵێم:

بە حەرامکردنی ڕیبا و فەرزکردنی زەکات. شایەتیشم لەمەدا ئەم فەرموودانەی خوای گەورەیە:

﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾، ﴿يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا﴾، ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾.

لە چوارەمدا وتبووی:

ئیسلام چۆن دەڕوانێتە گیروگرفتەکانی گرۆی مرۆڤ؟

دەڵێم:

هەوڵ و کۆشش بناغەیە و، دەشبێ سامانی مرۆڤ لە دەستی ستەمکاراندا کۆ نەبێتەوە و لە گەنجینەکانیاندا کەڵەکە نەکرێت. شایەتیشم لەمەدا ئەم فەرموودانەی خوای گەورەیە:

﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾، ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[1].

* * *

(١) سەد "ماشەڵڵا" لەم وەڵامە! (دانەر)

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە .
* لە گوندی "نوورس"ی نێو چیا بڵندەکانی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی منداڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە منداڵەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" نێژراون.
* چوارەم منداڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن:

(دوڕڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).

* لە پێشدا لە لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برا گەورەی دەستی بە سەرەتاکانی خوێندن کردووە. پاشان چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و، لای زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەست هێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.

* لەبەر زیرەکیـی نـاوازە و لە ڕادەبەدەری، نازنـاوی (سـەعیدی مەشـهوور) پاشـان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسـە هەوڵـی داوە بـۆ دامەزرانـدنی زانکـۆ لە کوردسـتاندا و، کـردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سـەردەم شـان بە شـانی زانسـتە ئاینییەکـان. لەم پێناوەشـدا لە لایەن دوا دەسـەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسـمانییەوە ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.
* گەورەترین زانا و کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمەیە کە لە دوای مەولانـا خالیـدی نەقشـبەندی لەنـاو نەتەوەی کـورددا هەڵکـەوتووە و، ناوبـانگی جیهـانیی بـۆ دروسـت بـووە و، لە ڕووبەرێـکی فـراوانی سـەر زەویـدا سـوود لە بەرهەمەکـانی وەردەگیرێت.
* تاقانە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی ڕژێمـی مسـتەفا کەمـال و، سی و پێنج ساڵی بەندی و دوورخستنەوە و دەیان دادگای تـۆقێنەر نەیـانتوانیوە چـۆکی پـێ دابـدەن و لە خەبـاتی ڕەوای خـۆی کـۆڵی پـێ بـدەن. تەنـانەت ئەو توانیـویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێـر ناونیشـانی (**سـەرجەمی پەیامەکـانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێـڕانی سـەرجەمی پەیامەکـانی نـوور بـۆ (زمـانی عەرەبی) لە لایەن مامۆسـتا (ئیحسان قاسم صـاڵحی)یەوە لە دە دانە بەرگـی گەورەدا تەواو بـووە و، لە وڵاتـانی تورکیا و میسـر و هیندسـتان و عەرەبسـتانی سعوودی چەنـد چـاپێکی یەك لە دوای یەکیان تا ئێستا لێ بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوکران واحیـدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و، تا ئێستا چەندین بەرگی گەورەیـان بە چـاپی جـوان و مۆدێرن بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.

*بە (**زمانی کوردی**)ش (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)مان بە پشتیوانیی خوای گەورە لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ کردووە، جگە لە چل و چوار کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.

* هەروەها چەندین کتێبی تر کە بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاوکراونەتەوە.

* چەند بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:

(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتاڵی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەکی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیکی، تەتاری، تالْشی، تورکمانی، جۆرجی، چینی، دانیمارکی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسکریتی، سلۆڤاکی، سەواحیلی، سویدی، فەڕەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرغیزی، کازاخی، کۆری، کرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیری، هۆسا، هیبرۆ، هیندی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی).

* تا ئێستا زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.

* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.

* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبوڵ لە بەرواری (١-٣/١٠/٢٠١٧ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.

* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).

* هەروەهــا كۆڕبەنـدێك لە بەرواری (٢٠١٣/١٢/٢١ز) لە شــاری هەولێــر لە لایەن پەیمانگــای زانســتە ئیســلامییەكان و وەزارەتی ئەوقــافی حكــوومەتی هەرێمــی كوردستانەوە ڕێكخرا بە بەشداریی چەنـد تـوێژەرێكی نـاوخۆی كوردسـتان و وڵاتی توركیا و، بە ئامادەبوونی دەیان كەسایەتیی زانستی و ئایینیی عێراق و هەرێم.

* هەروەها لە بەرواری (٢٠١٥/١٢/١٢ز)دا لە شاری هەولێـر نەدوەیەكی زانسـتی لە لایەن (ڕێكخراوی پەیامی پاك)ەوە بۆ مامۆسـتا نـوورسی و پەیامەكـانی سـاز كـرا بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەكانی نووردا" كە چەند توێژەرێكی زانكـۆی دیجـلەی باكووری كوردستانیش بەشدارییان تێدا كرد.

* هەروەها لە بەرواری (٢٠١٦/٣/٢٦ز)دا لە شاری هەولێـر لە لایەن (ئەمینـدارێتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق)ەوە و بە بەشـداری لەگەڵ سـەنتەری ڕۆشـنبیریی (وقف الخيرات)دا نەدوەیەكی ڕۆشنبیری بە ناوی (الإمام بديع الزمان سعيد النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان) بەڕێوەچوو كە چەند بـاس و بـابەتێكی بە زمـانی عەرەبی تێدا پێشكەش كرا.

* دەزگای چاپ و پەخشی سـەردەم لە شـاری سـلێمانی لە سـاڵی (٢٠١٦)دا ژمـارە (٨٩)ی بڵاوكراوەی (ڕۆڤار)ی تایبەت كـرد بە مامۆسـتا نـوورسی بە نـاوی (سـەعید نوورسی.. كلیلی گەنجینەیەكی شاراوە).

* هەتا ئێستا لە باشووری كوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەكانی (سلێمانی، سۆران، كەركووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

* * *

# پێڕستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

پێشەکی (نوورسی و ئەدەبی ئیمان) .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٥
چەند بریسکانەوەیەك لە نێوان هەردوو مانگی یەك شەوەی
ڕەمەزان و جەژندا .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١٧
بێداركردنەوەیەك .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١٩
گەیاندنی مەبەست .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢١
الداعي .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٣
دوو بەڵگەی مەزنی تەوحید .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٤
هۆكارەكان تەنها ڕواڵەتین .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٨
"بوون" تەنها بە جیهانی ماددییەوە بەند نییە .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٨
"یەكبوون"ی قەڵەمی توانست "تەوحید" ڕادەگەیەنێت .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٨
هیچ شتێك بە بێ سەرجەمی شتانی تر نایەتەدی .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٩
بزووتنی خۆر لەبەر كێش(جازبییەت)ە و، ئەویش لەبەر
توندڕاگرتنی كۆمەڵەكەیەتی .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٢٩
شتە بچووكەكان پەیوەستی شتانی گەورەن .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٣٠
ئیعجازێكی مەزن لە توێی هۆنینەوەی ڕێسای گەردووندا هەیە .. .. .. .. .. .. .. ٣٠
هەموو شتێك لە بەردەم توانستی خوادا یەكسانە .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٣٠
ئەو كەسەی جڵەوی سەرجەمی گەردوونی بەدەست نەبێت، ناتوانێت
یەك دانە گەردیلەش بەدی بهێنێت! .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٣١
"سروشت" بەدیهاتوویەكی خوای گەورەیە .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٣١

ویژدان بە جەزبە و مەستیی خۆی خوای گەورە دەناسێت ........ ٣٢
شایەتیدانی فیطرەت شایەتییەکی ڕاستە ........ ٣٢
"پێغەمبەرێتی" بۆ گرۆی مرۆڤ شتێکی پێویستە ........ ٣٣
میعراج موعجیزەیەکی پێغەمبەرە ﷺ بۆ مەلائیکەت، هەروەك لەتبوونی
مانگ موعجیزەیەك بوو پیشانی گرۆی مرۆڤ درا ........ ٣٣
بەڵگەی شایەتمان لەناو خۆیدایە ........ ٣٤
"ژیان" جۆرێکە لە درەوشانەوەی "وەحدەت" ........ ٣٤
"گیان" یاسایەکە بوونی دەرەکیی لەبەرکراوە ........ ٣٥
"بوون" بە بێ "ژیان"، "نەبوون"ە! ........ ٣٥
مێروولە بەهۆی "ژیان"ەوە لە زەوی گەورەترە ........ ٣٦
ئایینی "نەصرانی" تەسلیمی "ئیسلام" دەبێت ........ ٣٦
ڕوانینی تەقلیدی "مەحاڵ" بە "مومکین" دەبینێت ........ ٣٧
قورئان پێویستی بە "ئاوێنە" هەیە نەك بە "وەکیل"! ........ ٣٨
ئەو مرۆڤەی کە لەسەر ناحەقە، بە گومانی خۆی "ناحەق" بە
"حەق" دەزانێت! ........ ٣٩
ئاوێنەکانی "توانست" زۆرن ........ ٣٩
بەشەکانی "خۆنواندن" جۆراوجۆرن ........ ٤٠
دەگونجێ مرۆڤی لێهاتوو ببێت بە "موجتەهید" بەڵام هەرگیز نابێت
بە "موشەڕڕیع"! ........ ٤١
تیشکی ڕووناکیی "ژیری" لە "دڵ"ەوە ئاراستە دەکرێت ........ ٤٢
پلەکانی "زانست" لە مێشکدا جیاجیا و ئاڵۆزن ........ ٤٢
زانستێك کە تێگەیشتنی مەیسەر نەبێت نابێ بوترێتەوە ........ ٤٣
"کاولکاری" لە "بنیاتنان" ئاسانترە و، مرۆڤی لاوازیش
دەبێت بە کاولکار! ........ ٤٤
"هێز" دەبێ خزمەتی "حەق" بکات ........ ٤٤
هەندێ جار "شت" دژەکەی تێدا دەبێت ........ ٤٤
"سیاسەت"ی پابەندی "بەرژەوەندی" دڕندەیەکی سامناکە! ........ 45

لەبەر ئەوەی مرۆڤ هێزەکانی لە سنوورێکدا دەستنیشان نەکراون، ئەوا
تاوانەکانی هەمیشە لە گەورەبووندان! ........ ٤٥
هەندێ جار "خێر"ێك دەبێت بەهۆی "شەڕ"ێك ........ ٤٦
ئەگەر "کۆمەڵ" بێ ئامانج بێت، "خۆپەرستی"ی تێدا بەهێز دەبێت! ........ ٤٧
هۆکاری بووژانەوەی شڵەژان و ئاشووب: مردنی "زەکات" و
ژیانەوەی "ڕیبا"یە ........ ٤٧
گرۆی مرۆڤ گەر بەتەمای ژیانە، با هەموو جۆرەکانی
سوو(الرِّبا) لەناو ببات ........ ٤٨
مرۆڤ کۆت و زنجیری دیلیی تێکشکاند، ڕۆژێکیش دێت کە زنجیری
کرێگرتەییش دەپچڕێنێت! ........ ٤٩
ڕێگای نارەوا مرۆڤ دەگەیەنێتە پێچەوانەی ئامانجەکەی ........ ٥٠
"جەبرییە" و "موعتەزیلە" هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەك
حەقیقەتیان تێدایە ........ ٥٠
"دەستەوسانی" و "ترس" پیشەی مرۆڤی لاوازە ........ ٥١
هەندێ جار شتی بچووك، شتانی گەورەی لێ دەبێتەوە ........ ٥١
"یەك چرکە" بۆ هەندێ کەس وەك "ساڵێك" وایە ........ ٥١
"درۆ" وشەیەکی کافرە ........ ٥٢
ئەنجومەنێك لە "جیهانی میسال"دا ........ ٥٣
ئەگەر "مەجاز" بکەوێتە دەستی "نەزانی" بە "حەقیقەت"ی دادەنێت ........ ٦٥
موبالەغە لە مەدحدا زەمکردنێکی پەنهانە! ........ ٦٦
"ناوبانگ" ستەمکارە! ........ ٦٦
ئەوانەی "ئایین" لە "ژیان" دادەماڵن گرفتاری تیاچوون دەبن ........ ٦٧
"مردن" ترسناك نییە، وەك ئەوەی گومان دەبرێت ........ ٦٨
"سیاسەت"ی ئەم ڕۆژگارە لە جیهانی بیروڕاکاندا: "شەیتان"ە؛ دەبێ
"أعُوذُ بِاللّٰه"ی لێ بکرێت! ........ ٦٩
دەرخستنی "لاوازی"، دوژمن "ئازا" دەکات! ........ ٧٠
خوای گەورە بۆی هەیە بەندەی خۆی تاقی بکاتەوە، بەڵام بەندە مافی
تاقیکردنەوەی پەروەردگاری خۆی نییە ........ ٧٠

حەزت لە هەر شتێك كرد، زیادەڕەویی تێدا مەكە .......................... ٧١
چاوی عیناد "مەلائیكەت" بە "شەیتان" دەبینێت! .......................... ٧١
ئەگەر "حەق"ت دۆزییەوە، لە پێناوی "حەقتر"دا ئیختیلاف مەنێرەوە! .......... ٧٢
بەدیهێنان و كۆكردنەوەی شتانی دژ بە یەك حیكمەتێكی مەزنی تێدایە،
"گەردیلە" و "خۆر" لە دەستی توانستدا یەكسانن .......................... ٧٤
تایبەتكارییەكانت لە ژێر خاكی "پەنهانی"دا بنێژە، با گەشە بكەن! .......... ٧٦
"ئیسراف" دەرگایە بۆ "هەرزەیی" كە ئەویش مرۆڤ بەرەو
"نزمی" دەداتە بەر! .......................... ٧٨
"هەستەوەری چەشتن" فەرمانبەری تەلگرافە.. "لەزەت" مەكە بە خواست و
ئارەزووی، با لە ڕێ دەرنەچێت! .......................... ٧٩
جۆری ڕوانین وەك "نییەت" وایە، عادەت دەكات بە عیبادەت! .......... ٨١
لەم جۆرە سەردەم و ڕۆژگارانەدا "شەرع" بوار بە هەڵبژاردنی ژیانی
"ڕەفاهییەت" نادات .......................... ٨٢
ڕۆژێك دێت كە "نەبوونی نیعمەت" بە نیعمەت دادەنرێت .......................... ٨٢
هەموو گیروگرفتێك لایەنێكی خێری تێدایە .......................... ٨٣
خۆت بە گەورە پیشان مەدە، با بچووك نەبیتەوە! .......................... ٨٣
بە گوێرەی گۆڕین و جیاوازیی ڕێ و شوێن ڕەوشتەكانیش دەگۆڕێن .......... ٨٤
حەق سەردەكەوێت (الحَقُّ يَعْلُو) .......................... ٨٦
چەند دەستوورێك لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا .......................... ٩٠
ئافرەتان بە دەرچوونیان لە ماڵ مرۆڤایەتییان لە ڕێ دەركردووە، چار نییە
دەبێ بڕۆنەوە ناو ماڵ! .......................... ٩١
فراوانیی بواری هەڵسوكەوتی "توانست" دەست بە ڕووی
هۆكارەكانەوە دەنێت! .......................... ٩٣
"مەلائیكەت" سوپایەكن جێبەجێكردنی "یاسای سروشتی"یان
خراوەتە ئەستۆ .......................... ٩٥
"ماددە" هەتا ناسك و تەنكتر بێت "ژیان"ی تێدا بەهێزتر دەبێت .......... ٩٦
فەلسەفەی ماددی تاعوونێكی مەعنەوییە .......................... ٩٧
"بێكاری" لە بوونەوەردا نییە و، مرۆڤی بێكاریش لەنێو "وجود"دا

بۆ "عەدەم" تێدەکۆشێت .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٩٨
"ڕیبا" سەرتاپا زیانە بۆ موسڵمانان .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٩٨
قورئانی پیرۆز هەر خۆی بۆ خۆی پارێزگاری لە خۆی دەکات و
حوکمی خۆی ئەنجام دەدات .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ٩٩
"پێویستی" پتر داخوازی ئەوەیە کە "موسەللەمات" یاد بخرێنەوە تا ئەوەی
"شتانی نەزەری" بوترێنەوە .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١٠٢
حەدیث بە ئایەت دەفەرموێ: پێگەیشتنەوەت مەحاڵە! .. .. .. .. .. .. .. .. ١٠٣
کورتە باسێك لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١٠٤
کۆتایە دەستی "ئەدەب"ی غەربی هەوەسبازی هەواکاری "دەهاء"دار
ناگاتە ئاستی "ئەدەب"ی هەر ئەبەدیی قورئانی ڕووناکباری
شیفاکاری "هودا"دار!! .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١١١
پەلی درەخت بە ناوی "میهرەبانیی خوا"وە بەروبوومەکانی
پێشکەش دەکات .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١١٦
ڕوونکردنەوەی ئەو سێ ڕێگایانەی کە لە کۆتایی سوورەتی "فاتیحە"دا
ئاماژەیان بۆ کراوە .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١١٧
هەموو ئازارێك لە گومڕاییدایە و، هەموو چێژ و لەزەتێکیش لە ئیماندایە .. .. .. ١٢١
وەڵامێك بۆ کەنیسەی ئەنگلیکی .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١٣١
پوختەیەك لە ژیانی دانەر .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ١٣٣

* * *

# چەردەیەک وانەی ئیمانی

لە وانەکانی ئەم چەردەیە:

- ئەو کەسەی جڵەوی هەموو گەردوونی بەدەست نەبێت، ناتوانێت یەك گەردیلەش بەدی بهێنێت.
- هۆنینەوەی ڕێسای گەردوون ئیعجازێکی مەزنی تێدایە.
- ئەوانەی "ئایین" لە "ژیان" دادەبڕن، گرفتاری تیاچوون دەبن.
- گەیاندنی پەیامی قورئان پێویستی بە "ئاوێنە" هەیە نەك بە "وەکیل"!
- جیاوازیی نێوان ئەدەبی قورئان و ئەدەبی خۆرئاوا.
- "هێز" دەبێ خزمەتی "حەق" بکات.
- فەلسەفەی "ماددی" تاعوونێکی "مەعنەوی"یە!

## نُبْذَةٌ مِن دروسٍ إيمانيّة

من كليات رسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

بديع الزمان سعيد النورسي

(رحمه الله)

## A Selection of Faith Lessons

From

The Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi



0-0265-0000-0

9 780026 500005

نرخی (١٥٠٠) دیناره